فضيلة الشيخ صالح بن فوزان الفوزان

# دۆسایەتی وخۆبەریکردن لە ئیسلامدا

# الوَلاَءُ وَالبرَاء

## في الإِسْلاَم

وەرگێڕان ولەسەرنوسینی
**علی خان**

چاپی دووەم
١٤٣٩هـ

# مـافی لەچاپدانەوەی پارێزراوە ©

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب | الولاء والبراء في الإسلام |
| نوسینی | العلامة صالح بن فوزان الفوزان |
| شەرحکردنی | **مـامۆستا علی خان** |
| تایپ | **کاکە** |
| نەخشەسازی | **جلیل إبراهیم** |
| دیزاینی بەرگ | |
| ساڵی چاپ | ١٤٣٣ ـ ٢٠١٢ |
| نۆرەی چاپ | **یەکەم** |
| شوێنی چاپ | |
| تیراژ | |
| ژمارەی سپاردن | **ژمارە سپاردنی ( )ی ساڵی ( ) وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.** |

## پێشەکی مامۆستای بەڕێز:

## مامۆستا خەلیل ئەحمەد

سوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان کە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً وَقَالَ إِنَّنِي مِنْ الْمُسْلِمِينَ﴾.

وسەلات وسەلام لەسەر باشترین بانگخواز بۆ تەنها خواپەرستی گەورەمان «موحەممەد» ولە کەس و کاری باوەڕداری و خێزان و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانیان بە چاکە تا ڕۆژی دوایی.

پاشان: بەڕاستی دۆستایەتی و دژایەتی لە پێناو خودای گەورە پەیوەندییەکی گەورە و مەزنیان هەیە بە بیروباوەڕی موسڵمانەوە ، وشوێنەوارێکی وایان هەیە لەسەر ڕەوشتی موسڵمان کە ئینکار ناکرێت، ولەبەر

ئەوەی گەلانی موسـلّمان نوێنەرایـەتی تـەنها ئومـەتێك دەکەن کە بریتی یە لە ئومەتی ئیسلام پێویسـتە لەسـەر تاکی موسڵمان (کە خشتێکە لە خشتەکانی ئەم ئومەتە) کە ڕیزپەڕ نەبێت ولە کۆمـەڵی موسـڵمانان دەرنەچێت، وخۆشەویستی و دۆستایەتی ودڵسۆزی بۆ خودای گـەورەو پاشان بۆ کۆمەڵی موسڵمانان هەبێت وەك خـوای گـەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُـوا﴾ [المائدة:٥٥].

وهـەموو هەسـتەکانی پەیوەسـت بێـت بـە ئومـەتی ئیسـلامەوە وەك پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی : «مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِم وَتَعَاطُفِهِمْ كمَثَلِ الْجَسَدِ الواحد، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَـائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى» متفق عليه عن النعمـان بـن بشير واللفظ لمسلم.

جا باوەڕ کاملْ نابێت بە دۆستایەتی و دژایەتی لە پێناو خودا نەبێت ، وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێت : «مَنْ أَحَبَّ لِلَّه وَأَبْغَضَ لِلَّه وَأَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ»، (رواه الامام أحمد وأبو داود والترمذي وهو في السلسلة الصحيحة للشيخ الألباني).

وئەوەش بزانە ئەم دۆستایەتی ودژایەتی یە مەسەلەیەکی گرنگ وبنچینەیەکی مەزنە لە بنچینەکانی باوەڕ.

وئەم کتێبەی کە بەڕێز مامۆستا علی خان وەریگێڕاوە کتێبێکی بەسوود وپوختە لەسەر ئەم بابەتە ولە لایەن (شێخ فوزان)ەوە نوسراوە کە کەسێکی ناسراوەو هەڵکەوتوە لە بواری عەقیدە، وبەیەکێك لە

متمانــه پێكراوەكــان دادەنرێــت لــە عەقیــدەی ئــەهلی سوننەدا خوای گەورە بیپارێزێت.

ئەم وەرگێڕانەش لەسەر داوای بەڕێز مامۆســتا علــی خان كە پێداچوونەوەی بۆ بكەم بینیم وەرگێڕانەكەش وەك ئەسڵەكەی پوخت و بێ گرێیە، لە كۆتایــدا داواكــارم لــە خوای گەورە پاداشتی هەموو لایەكمان بە خەیر بداتەوە، وخوێنەری بەڕێزیش سودمەند بێت لە خوێندنەوەی. آمين

وصلى الله على محمد وآله وصحبه وسلم.

# پێشەکی

«سوپاس بۆ خوا، سوپاس بۆ پەرستراوی هەق، سوپاسێك شایستە بێ بە جەلالەت وگەورەیی ئەو، بەردەوام بێ بە بەردەوامی ئەو، قورس و سەنگین بێ بە سەنگینی عەرشی ئەو، فراوان و زۆر بێ بە زۆری دروستکراو و وشەکانی ئەو، بە ژمارەی ئەوەی بەچاو دەبینرێ و ئەوەشی بەچاو نابینرێ لەسەرسوڕهێنەرەکانی قودرەتی ئەو، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە دڵمانی بە نووری ئیسلام ڕووناك کرد، تاریکیی وچەوتی نەفامیی لەسەر دڵمان لابرد، سوپاس بۆ خوا لەسەر نیعمەتی ئیسلام، ئیمان، ئەمان، سوننەت، لە سەر نیعمەتی قورئان، سوپاس بۆ ئەو خوایەی، کە هەقی سەرخست و دەرخست، ناهەقی لابرد و ژێر خست، سوپاس بۆ خوای بێ شەریك، بێ ڕەفیق، بێ هاوەڵ، بێ هاوسەر، تەنیا لە

ناوەکانیا، تەنیا لە سیفەتەکانیا، تەنیا لە زاتیـا، تـەنیا لە کرداریا، هـیچ شـتێك وەکـو خـوا نیـە و هـەر ئـەوە بیسەری بینا، تاکە بیٚ نیاز، تاکە جێی نیاز، بیٚ نیاز بە هـەموو مـەخلوقات، جێـی نیـازی خـەڵك و کـەون و کائینات، نە لە کەس بووە و نە کەسی لیٚ بـووە، زانـا و ئاگادارە بەوەی بـووە و بـەوەی ئـەبیٚ، بـەوەی نـەبوە و بەوەشی نابیٚ، گەر ببوایە چۆن دەبوو، بـۆ نـەبووە و بـۆ نابیٚ؟

بیسەر و دانا و زانا، بیسەری هەموو دەنگـێگ، بـە هەر ڕەنگێك، بە هەر لوغـەتێك، زانا بەوەی پـێش ووتـن چی دەڵێی بە چی نیەتێك، زانـا بـە هـەموو نهێنیـەك، بەوەشی حەشار دراوە لە سنگی هـەر کەسـێك، بینـەری مێروولەی ڕەش، لەسـەر بـەردێکی ڕەش، لـە شـەوێکی ڕەش، بیسەری خشەی پێی، بەرزی وپیرۆزی ومەزنی بـۆ

ئەو خوایەی کە گەڵایەك لە دارەکەی بەر نابێتەوە مەگەر بە ئیزن و ئاگا و زانستی ئەو نەبێ، بەر ئەبێ یا بەر نابێ، شایستەی هەموو سوپاسێك، شوکرێك، سەنایەك، مەدحێك، لەهەر کاتێك، لە هەر بارێك.

شایەتی ئەدەم -شایەتومانێك ڕزگارم کا و سوودم پێ بگەیەنێ لە ڕۆژێك، کە نەماڵ و نە سامان سوود ناگەیەنن تۆسقاڵێك، مەگەر کەسێك دڵی ساغ بێ و لە بۆ خوای گەورە سوڵحا بێت چۆن سوڵحانێك- کەوا هیچ پەرستراوێك بە هەق نیە، تەنها الله نەبێت، هەر الله شایستەی پەرستن و ڕوولێکردن و هاوارپێکردنە، جگە لە ئەو هیچی تر شایستەی پەرستن نییە. تەنها ئەو شایستەی پەرستنە، هەرچی غەیرە ئەو هەیە سەرەنجامی بۆ نەمان و فەوتان و لەناوچوونە. «أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله»، سوپاس بۆ ئەو خوایەی

که پێغەمبــەرێکی بــە «رَحْمَـةً لِلْعَـالَمِين» ڕەوانــە کــرد، هەرچــی خراپــی و چــەوتیی و چــەپەڵی و گەنــدەڵی و هەڵدێری و ستەمی ڕوونکردەوە و لابرد. شـایەتی ئـەدەم کەوا موحەممەد بەندە و پەیامبەر و ڕەوانە کراوی خوایە، ڕەوانەی کرد لە بۆ سـەرجەمی گـەلان، خۆشەویسـتمان، مامۆستامان، سەرمەشقمان، نوری چاومان، بـە جـوانی بە ئەرکەکەی هەستا، بە بێ وچان، بە بێ وەستان، بە بێ کۆڵدان، بە تێکۆشان، بە جوانی بانگەوازەکـەی گـەیان، خەڵکی لە خەو هەستان، تا ئـەوەبوو: نـەزانی فێرکـرد، چەوتی ڕاستەوە کرد، پیسی پاکەوە کرد، لێڵـی ڕوونـەوە کرد، تاریکی ڕۆشنەوە کرد، غـەم و خەفـەت و پـەژارە و نارەحـەتی و نەهامـەتی و مەینـەتی و شـەڕ و ئاشـوبی لابرد -بە نەفس ومـاڵ وسـامان ودایـك وباوکمـەوە بـە فیدای خۆی وڕێبازەکەی بم-، بەزەیی و ڕەحمـەت لـە بـۆ

جیهانیان، سەلات وسەلامی خوا لەسەر خۆی وخانـەوادە وکـــەس وکـــارە پـــاك وبـــەڕێزەکانی، هاوەڵـــە مـــەرد وجوامێرەکـانی، وخێـزان و شـوێنکەوتووانی بەچـاك تـا ڕۆژیی دوایی))[١].

داوی ئەوە.

**خوێنەری سەنگین:** ئەم کتێبە باس لە یەکێك بابەتـە گرنگەکانی ئیسلام دەکات، کە یەکێکە لە داخوازیەکانی شـەیەتومان، لـە پێویسـتیەکانی خۆشویسـتنمان، بـۆ پەروەردگارمان، بۆ پەیامبەرمان، بۆ دینمان. چونکە کە خوامان خۆشویستوە، ئەبێت خۆشەویستەکانی ئەویشمان خۆشبوێت، دوژمنەکانیمان ڕق لێبێت.

---

[١] بڕوانـە: پێشـەکی کتـێبی «دەمێـك لـە مێـژوی ئیسـلام» بـە دەستکاریەوە.

کــه پەیامبــەرمان خۆشویســتوە -لەبەرئــەوەی خۆشەویســتی خوایــە- ئــەبێت خۆشەویســتەکانیمان خۆشبوێت، دوژمنەکانیمان ڕق لێبێت.

که دینی ئیسلامان خۆشویستوە -لەبەر ئەوەی دیــنی هەڵبــژێردراوی خوایــە-، ئــەبێت خۆشەویســتانیمان خۆشبوێت، دوژمنانیمان ڕق لێبێت.

ئەمانەش مەعلومن وبانگەشەی خۆشویستنی لەسەر ڕاوەســتاوە، لــە عەقڵیشــدا مــومکین نیــە بانگەشــەی خۆشویستنی خۆشەویســتێك بکــەیت وخۆشەویســتانیت خۆشنەوێت، یــان بــڕۆی دوژمنانیــت خۆشــبوێت، ئەمــە پێمان دەڵێت ئەو بانگەشەکردنە ڕاست نیە، بــەڵکو دژی بانگەشەکەیە، چونکە کە دوژمنیــت خۆشویســت، یــانی ڕقت لەمە، کە خۆشەویستەکانیت خۆشنەویســت، یــانی ئەمیشت خۆشناوێت.

ئیبن قەییم لە نونیەکەی خۆیدا ئەڵێ

أَتُحِبُ أَعْدَاءَ الْحَبِيبِ وَتَدَّعِي حُبًّا لَهُ مَا ذَاكَ فِي إِمْكَانِ

وَكَذَا تُعَادِي جَاهِدًا أَحْبَابُهُ أَيْنَ الْمَحَبَّة يَا أَخَا الشَّيْطَانِ

لَيْسَ الْعِبَادَةُ غَيْرَ تَوْحِيدِ الْمَحَبَّـ ـةِ مَعَ خُضُوعِ الْقَلْبِ وَالأَرْكَان

ئەمە سەرباری ئەوەی: ئەم باسە وەکو شێخ حەمەد بن عەتیق -رحمه الله-، ئەڵێ: «هیچ حوکمێك نیە لە قورئاندا بەڵگەی لەم حوکمە -واتە الولاء والبراء- زیاتر ورونتری لە بارەوە هاتبێت، دوای باسی تەوحید[٢]»[٣].

[٢] ئەگەرچی ئەم باسەش لە باسە گرنگەکانی تەوحیدە، بەڵام پێدەچێت مەبەستی لەڕوی «المطابقە»وە بێت، نەك لە ڕوی «التضمن» و«اللزوم».

«بەڕاستی یەکێك لــە گــەورەترین واجبــەکان بەســەر ئیمانداره‌وه‌: خۆشویستنی خــوا وخۆشویســتنی ئەوانەیــه کە خۆشی دەوێت: لە گوفتارەکان وکردارەکان بە ئاشــکرا ونهێنیانەوە، هەورەها خۆشویستنی ئەو شــتە دیارانەیــە «الأشــخاص»[٤]: وەکــو فریشـــتەکان وپیـــاو چـــاکان، ودۆستایەتیان بکەیت، هەورەها ڕق لێبونی ئــەوەی خــوا ڕقــی لێیــەتی: لــە گوفتارەکــان وکردارەکــان بــە دیــار ونادیاریانەوە، کــە ئــەم بنچــینەیە لــە دڵــی ئیمانــداردا چەسپا، ئەوسا دڵنیا نابێت لە دوژمنی خــوا، ولەگەڵیــدا دانانیشێت.. بەڵام کــە ئــەم بنەمایــە لــە دڵــی زۆربــەی

---

[٣] سبيل النجاة والفكاك من موالاة المرتدين والأتراك، ص١٤، للشيخ حمد بن عيق.

[٤] لە زماندا واتە: «كُلُّ جِسْمٍ لَه ارْتِفاع وظُهُور» بەڵام بۆ مــرۆڤ زاڵترە لەچاو بەکارهێنانی بۆ شتەکانی تر. بڕوانە: «المعجم الوسيط»

خەڵكدا لاواز وسست بو، دەبینی زۆربەی خەڵك وای لێهاتوە لەگەڵ دۆستانی خوا چۆنە لەگەڵ دوژمنانی خواش وایە، تەنانەت (وەختە) وڵاتی ئیسلام وەك وڵاتی حەربی لێدێت، ونەترساون لەو تورەییەی خوا، کە ئەرز وئاسمانەکان وشاخە تۆکمەکان، توانای هەڵگرتنی تورەیی ئەویان نیە »[٥].

بۆیە هەستاین بە وەرگێڕان وڕونکردنەوەی ئەم کتێبە بچوکە لە قەبارە، گەورە لە ناوەڕۆك، بە ئومێدی ئەوەی ببێتە مایەی پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەی لەم بوارەدا لە دڵان وکتێبخانەکان بەدی دەکرێت، خوای گەورە

---

[٥] من كلام الشيخ حمد بن عتيق رحمه الله بتصرف، نقله عنه الشيخ عبد العزيز بن محمد السلمان رحمه الله، نقلته عنه من كتابه: «موارد الظمآن لدروس الزمان».

هیدایــەتی دڵمــان بــدات، وزانســتی بەســود، وکــرداری چاکمان پێ ببەخشێت، والله هو الهادی والموفق للصواب.

ئەگەرچی ئەمە زیاتر لە شەش ساڵ بەر لە ئێستا بو، بەڵام بە هۆی سەرقاڵیەوە نەمپەرژا ڕێکیبخەم وبەچاپی بگەیەنم، تا ئەوەبو خوای گەورە ئاسانی کرد ڕێکمان خست وپێداچونەوەمان کرد وئامادەمانکرد بۆ چاپ -وهەمیشە داوای ئاسانکاری لێدەکەین-.

جا هەرچی لە پەراوێزەکان هەبێت زیادەی خۆمن بۆیە بە پێویستم نەزانیوە هەمو جارێك ئاماژەی پێ بدەم.

لە مەتنەکەش زیادەکانی خۆم دەخەمە نێو ئەم دو کەوانەوە [ ].

له خوای میهرەبان دەپاڕێمەوە -سەرباری بوونی کەم وکوررتی لە ناوەڕۆکی کتێبەکە وتێکەڵبونی نیەتی وەرگێڕەکە- بە گەورەیی ومەزنی وفەزڵ وبەخشندەیی ونیانی ومیهرەبانی خۆی، لێمانی وەربگرێت، ، ئەوەش ئومێد وهیوامانە بە پەروەردگارمان، پەروەردگارا تۆی بیسەر وزانا.

علی خان

زولحیججەی ١٤٢٧هـ

پاشان لە شەعبانی ١٤٣٣هـ پێداچونەوەی کرا

لە مزگەوتی قازی محمد لە کەلار، لە گەڕەکی سیروان

# دۆستایەتی وخۆبەریکردن لە ئیسلامدا

سوپاس وستایش بۆخـوا، وصـەلات وسـەلام لەسـەر پەیامبەری خوا وئال وبەیت وهـاوەڵانی وشـوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی، پاشان.

بێگومـان پـاش واجـب بـونی خۆشویسـتنی خـوا وپەیامبەرەکەی، پێویستە خۆشویسـتیمان بـۆ دۆسـتانی خوا ودژایەتیکردنی دوژمنانی هەبێت[٦].

---

[٦] ئێمە وەکـو ئـەهلی سـوننەت تـەنها خوامـان لەبـەر خـۆی خۆشدەوێت، جگە لە خوا هەر کەس وشتێکمان خۆش بوێـت لەبـەر خوا جل جلالە خۆشمان دەوێت ولەبەر خودی خۆی خۆشمـان ناوێـت، پەیامبەرانمان خۆشدەوێت لەبەر ئەوەی پەیامبەری خوان، پیاوچاکان ودۆسـتانی خوامـان خۆشـدەوێت لەبـەر ئـەوەی بۆخـوا صـوڵحاون ودۆسـتی خـوان، کەعبـەمان خۆشـدەوێت چـونکە خـوا سـبحانە کردویەتی بە قیبلە وماڵی خۆی، جا هەرشتێکمان خۆشبوێت لەبـەر =

خۆشەویستیمانە بۆ خوا، خۆشەویستیش خۆشەویستی خۆشەویستەکەی خۆشدەوێت. قال شيخ الإسلام: «..وَأَحَبَّ الْمَخْلُوقَ لِلَّهِ لَا لِغَرَضٍ آخَرَ، فَكَانَ هَذَا مِنْ تَمَامِ حُبِّهِ لِلَّهِ، فَإِنَّ مَحَبَّةَ مَحْبُوبِ الْمَحْبُوبِ مِنْ تَمَامِ مَحَبَّةِ الْمَحْبُوبِ، فَإِذَا أَحَبَّ أَنْبِيَاءَ اللَّهِ وَأَوْلِيَاءَ اللَّهِ لِأَجْلِ قِيَامِهِمْ بِمَحْبُوبَاتِ الْحَقِّ لَا لِشَيْءٍ آخَرَ، فَقَدْ أَحَبَّهُمْ لِلَّهِ لَا لِغَيْرِهِ. وَقَدْ قَالَ تَعَالَى: ﴿فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةً عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةً عَلَى الْكَافِرِينَ﴾. وَلِهَذَا قَالَ تَعَالَى: ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ فَإِنَّ الرَّسُولَ يَأْمُرُ بِمَا يُحِبُّ اللَّهُ، وَيَنْهَى عَمَّا يُبْغِضُهُ اللَّهُ، وَيَفْعَلُ مَا يُحِبُّهُ اللَّهُ وَيُخْبِرُ بِمَا يُحِبُّ اللَّهُ التَّصْدِيقَ بِهِ، فَمَنْ كَانَ مُحِبًّا لِلَّهِ لَزِمَ أَنْ يَتْبَعَ الرَّسُولَ فَيُصَدِّقُهُ فِيمَا أَخْبَرَ وَيُطِيعُهُ فِيمَا أَمَرَ وَيَتَأَسَّى بِهِ فِيمَا فَعَلَ، وَمَنْ فَعَلَ هَذَا فَقَدْ فَعَلَ مَا يُحِبُّهُ اللَّهُ، فَيُحِبُّهُ اللَّهُ، فَجَعَلَ اللَّهُ لِأَهْلِ مَحَبَّتِهِ عَلَامَتَيْنِ: اتِّبَاعَ الرَّسُولِ، وَالْجِهَادَ فِي سَبِيلِهِ».

یــەکێکیش لــە بنــەماکانی بیروبــاوەڕی ئیســلامی ئەوەیــە[٧]: «فــەرزە لەســەر هــەمو موســڵمانێك کــە بیروباوەڕی ئیسلامی هەڵگرتوە، دۆستایەتی موســڵمانان بکــات ودژایــەتی دوژمنانیــان بکــات، خــەڵکانی یەکتاپەرســت وموخلیصــی خۆشــبوێت ودۆســتایەتیان بکــات، وڕقیشــی لــە هاوبــەش پەیداکــەرەکان هــەبێت ودوژمنایەتیان بکات»[٨].

---

[٧] بۆیە لە بنەماکانە چونکە تۆکمەبونی نێو مــاڵی موســڵمانان وبەردەوام بونیان وپێشکەوتنیان لەســەر ئــەم بنەمایــە ڕاوەســتاوە، هەروەها لە داخوازیەکانی خۆشویستنی خوایە.

[٨] گەلێك جار نەفام ودڵ نەخۆش ودەغەڵەکان ئەڵێن: بۆ باســی دۆستایەتی وڕق لێبون، لەکاتێکدا ئەم سەردەمە سەردەمی برایەتی وپێکەوە ژیانە، هەر ئیسلامە تۆوی ڕق وکینە دەچێنێت؟!

=

ئەمـــــەش لـــــە بیروبـــــاوەڕی دیـــــنی ئیـــــبراهیم وهاوەڵەکانیەتی، ئەوانەی کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردوین شوێنیان بکـەوین وچـاویان لێبکـەین[٩]، وەك

---

لە وەڵامدا ئەڵێین: سەرەتا ئەم سەردەمە بە پێچەوانەوە لەسایەی دیموکراتیدا زۆرترین کوشتار وجەنگی تێدا بوە بـە درێـژای مێـژوی مرۆڤایەتی سەردەمێکی وا خوێناوی کەم وێنەیە.

دووەم: ئەمە کام بەرنامە وئاینی ئاسمانی یـان زەمینیـە ئـەڵێ: دوژمنەکەت لە هەر کوێ بینی ماچـێکی نێـو چـاوانی بکـە، کـام بەرنامەیە کام حیزبەیە کام ئاینەیە ئەڵێ دوژمنەکەت خۆش بوێـت وڕقت لێ نەبێت ونهێنی خۆتی لەلادا باس بکە وەکو ئەو بکە وبخـۆ وبخۆرەوە وبپۆشە وهەڵسە ودانیشە...؟؟!!، بێگومان هیچ ژیرێك وا ناڵێ وناکات.

[٩] تەنها لە یەك شت نەبێت شوێنی ئیبراهیم ناکەوین، ئـەویش داوای لێخۆشبون کردنە بۆ بێباوەڕ وموشریك، ئەمەش ئەو ئایەتەی شێخ باسی دەکات، هەڵاوێری کردوە وئەفەرموێ: ﴿إِلاَّ قَوْلَ إِبْـرَاهِيمَ =

لأَبِيهِ لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنْ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ واتە: «لەهەمو شتێکدا ئیبراهیم بکەنە جێگای چاولێکەری خۆتان، تەنها لەوە نەبێت کە بە باوکی خۆی وت: داوای لێخۆشبونت بۆ دەکەم لەلای خوا، هیچ دەسەڵاتی خواشم نیە، پەروەردگارا پشتمان بە تۆ بەستوە وهەر بۆ لای تۆش گەڕاوینەتەوە، سەرەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە».

ئەمەش چۆن بوو؟

کاتێک ئیبراهیم بانگەوازی باوکی کرد بۆ یەکتاپەرستی وازهێنان لەبت پەرستی، باوکی بەرپەرچی ئیبراهیمی دایەوە، خوای گەورە فەرموی: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَبِيًّا *إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنْكَ شَيْئًا *يَا أَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءَنِي مِنَ الْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَاتَّبِعْنِي أَهْدِكَ صِرَاطًا سَوِيًّا *يَا أَبَتِ لَا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَنِ عَصِيًّا *يَا أَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِنَ الرَّحْمَنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيًّا *قَالَ أَرَاغِبٌ أَنْتَ عَنْ آلِهَتِي يَا إِبْرَاهِيمُ لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَاهْجُرْنِي مَلِيًّا *قَالَ سَلَامٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي إِنَّهُ

=

كَانَ بِي حَفِيًّا *وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَأَدْعُو رَبِّي عَسَى أَلَّا أَكُونَ بِدُعَاءِ رَبِّي شَقِيًّا﴾. جا ئیبراهیم علیه السلام فەرموی: سڵاوت لێبێت، من داوای لێخۆشبونت بۆ دەکەم لە لای خوا، خوای گەورە بە لوتفە لەگەڵمدا». جا خوای پەروەردگار دەفەرموێت ئەم خەسڵەتەی ئیبراهیم مەکەنە جێگای چاولێکەری وداوای لێخۆشبون بۆ موشریك وکافران مەکەن. پەروەردگاریش باسی ئەو حاڵەتەی پێغەمبەر ئیبراهیم دەکات وعوزرەکەی لەسەر ئەو قسەیەی ڕون دەکاتەوە.

ئەویش ئەوەیە کە بۆی ڕون دەبێتەوە باوکی دوژمنی خوایە ولەسەر شیرکەکەی سورە، ئەوسا حاشا لە باوکی دەکات: ﴿وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَنْ مَوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ﴾ [التوبة:١١٤]. پێشتر ئیبراهیم علیه السلام باوکی بە جاهیل دەزانی بۆیە پێی وت: «سلام علیك» ئەمەش وتەیەکە بە خەڵکی جاهیل دەوترێ، وەکو پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ﴾ هەروەها:

=

خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَداً حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾ [الممتحنة: ٤].

واتە: «ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە.. بەڕاستی لە ئیبراهیم وشوێنکەوتوەکانیدا نمونەی چاك هەیە بۆ ئێوە کە چاویان لێبکەن وانەیان لێوە فێربن، کە بە گەلەکەی خۆیانیان وت: ئیمە بەرین لەئێوە ولەو شتانەشی کە لە

---

﴿وَقِيلِهِ يَا رَبِّ إِنَّ هَؤُلَاءِ قَوْمٌ لَا يُؤْمِنُونَ*فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ هەروەها: ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا﴾. جا بە جاهیلی زانیوە بەڵام کە بینی دوای پیشاندانی بەڵگەکان هەر سورە لەسەر شیرکەکەی ودەستبەرداری نابێت، تەبەڕای لێکرد.

غەیرە خوا دەیپەرستن، بێ باوەڕین بە ئێوە وبەو دین وئاینەشی ئێوەی لەسەرن، ئیتر دوژمنایەتی ورقەبەرایەتی لە نیوانماندا بەرپابوە تا ئەو کاتەی باوەڕ بە خوای تاك وتەنها دەهێنن»[١٠].

هەورەها دینی موحوممەدیشە صلى الله عليه وآله وسلم، خوای تەعالا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ [المائدة:٥١].

واتە: «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، نەکەن جولەکە وگاور بکەن بە دۆست وپشتیوان وهاوکار ویاریدەدەری

---

[١٠] ئەمەش واتای: «لا إله إلا الله» یە...
«لا إله» = ﴿إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ..﴾
«إلا الله» = ﴿حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾

خۆتان، ئەوانە هەندێکیان دۆستی هەندێکی تریانن، جا هەرکەس لە ئێوە دۆستایەتیان بکات ئەوە لەوانە وحسابی وەك ئەوان بۆ دەکرێت، بێ گومان خوای گەورە هیدایەتی گەلی ستەمکار نادات)).

ئەمەش بۆ حەرامێتی دۆستایەتیکردنی خاوەن کتێبەکانە بە تایبەت[11].

---

[11] ئەگەر ڕق لێبونی گاور وجولەکە واجب بێت ودۆستایەتیان حەرام بێت لە کاتێکدا خاوەن کتێبن وکتێبەکە وپەیامبەرەکەی ئێمەش بەڕاستخەرەوەی ئەوەی ئەوان بێت، بەڵکو قورئان بڵێت: نزیکترین بێ باوەڕان لێتانەوە گاورەکانن، سەرباری ئەوەش: ڕق لێبونیان واجب بێت ودۆستایەتیان حەرام بێت، ئەی چ جای شیوعی وبوزی وئاگر پەرست ولیبڕاڵی وعەلمانی و...هتد...

سەبارەت بە حەرامێتی دۆستایەتیکردنی سەرجەم بێ باوەڕان بە گشتی، دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ﴾ [الممتحنة: ١].

واتە: «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من ودوژمنانی خۆتان مەکەن بەدۆست ویار ویاوەر وپشتیوان وجێگای متمانەی نهێنیەکانی خۆتان»[١٢].

---

[١٢] هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەش چیرۆکێکە کە لە صەحیحی بوخاری موسلیمدا هاتوە، عەلی رضي الله عنه ئەڵێ: پەیامبەری خوا صلی الله علیه وسلم من وئەبو مەرسەدی غەنەوی وزوبەیری نارد -لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا ئەڵێ میقدادی کوڕی ئەسوەد- وهەمویشمان ئەسپ سوار بوین، فەرموی: بڕۆن هەتا دەگەن بە «باخەکەی خاخ - شوێنێکە نزیك مەدینە-»، لەوێدا ئافرەتێك لە موشریکەکان دەبینن نوسراوێکی پێیە لە حاتەبی کوڕی بەلتەعەوە بۆ موشریکەکان، ئەوەبو گەیشتین پێی لەسەر وشترێکدا بو لەو شوێنەی پەیامبەر صلی الله علیه وسلم فەرموی، وتمان: بێنە =

نامەکە، وتـی: نامـەم پـێ نیـە، یخمـان بـە وشـترەکەیدا وگـەڕاین نوسـراوەکەمان نەدۆزیـەوە، هـەردو هاوڕێکـەم وتیـان: وانـازانین نوسراوی پێبێت، وتمان: پەیامبـەر صـلی الله علیـه وسـلم هـەرگیز درۆی نەکردوە، (عەلی وتی:) ئەو کتێبـە بهێنـە وەگـەرنا (سـوێند بـەوەی سـوێندی پـێ دەخـۆین) دڵنیابـە ڕوتـت دەکەینـەوە تـا دەیدۆزینەوە، کـە بـینی زۆر سـورن دەسـتی بـرد بـۆ پشـتێنەکەی ونامەکەی کە خرابوە نێو پەڕۆیەکەوە دەرهێنـا، -لـە ڕیوایـەتێکی بوخاریدا ئەڵێ: تەماشا دەکەین تێیدا نوسـراوە لـە حاتـەبی کـوڕی بەلتەعەوە بۆ خـەڵکانێك لـە موشـریکەکان لـە خـەڵکی مەککـە هەنـدێك هـەواڵی پەیامبـەری بـۆ نـاردبون- ئێمـەش بردمـان بـۆ پەیامبەری خوا صلی الله علیه وسلم، عومەر وتی: ئەی پەیامبەری خوا ئەوە خیانەتی کردوە لە خوا وپەیامبەر وئیمانداران، ئیزنم بـدە با لە گەردنی بدەم، فەرموی: ئەی حاتەب چی وای لێکردی ئـەوەی بکەی، وتی: (لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا: ئەی پەیامبەری خوا پەلـەم لێ مەکە، نە بێ باوەڕ بوم ونەهەڵگەڕاومەتەوە ونە ڕازیم بـە کـوفر دوای ئیسلام بونم، بەڵکو خۆشەویستیم بۆ ئیسـلام زیـادی کـردوە)

=

واللە هیچم نیە کە بێتە مایەی بێ باوەڕ بونم بەخوا وپەیامبەرەکەی صلى الله علیه وسلم، (نە گۆڕاوم ونەهەڵگەڕاومەتەوە) بەڵکو ویستم لای ئەو خەڵکەی قورەیش دەستێکم هەبێت بەهۆیەوە خوای گەورە ماڵ ومنداڵەکەم بپارێزێت، کەسیش نیە لە هاوەڵانت مەگەر لەوێ کەسانێکی هەیە لە عەشیرەتەکەی بەهۆیانەوە خوای گەورە ماڵ ومنداڵەکەی دەپارێزێت، پەیامبەر صلى الله علیه وسلم فەرموی: «ڕاست دەکات، هیچی پێ مەڵێن لە خێر نەبێت»، عومەر وتی: ئەوە خیانەتی کردوە لە خوا وپەیامبەر وئیمانداران، ئیزنم بدە با لە گەردنی بدەم، پەیامبەر صلى الله علیه وسلم فەرموی: ئایا لە بەشداربوانی شەڕی بەدر نیە، بەشکو خوا سبحانە ئەهلی بەدری بینی بێت فەرموبێتی: هەرچیتان دەوێت بیکەن، بەهەشتان بۆ مسۆگەرە، من لێتان خۆشبوم، ئەوەبو فرمێسك بە چاوەکانی عومەر هاتە خوارەوە و وتی: الله ورسوله أعلم، خوا وپەیامبەرەکەی زاناترن، (لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا: ئەوەبو خوای گەورە سورەتەکەی دابەزاندە خوارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا

=

بەڵكو خواى پــەروەردگار خۆشويســتنى بــێ بــاوەڕى حەرام كردوە، ئەگەر لە نــزيكترين كەســيش بێــت، خــوا سبحانە دەفەرموێت: ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا لا تَتَّخِـذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنْ اسْتَحَبُّوا الْكُفْـرَ عَلَـى الإِيمَـانِ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ﴾ [التوبة:٢٣].

واتــە: «ئــەى ئەوانــەى باوەرتــان هێنــاوە، بــاوك وبراكانتان مەكەن بە دۆستى خۆتان ئەگەر هاتو كوفريان لە ئيمان پێ باشتر بو، جا هەركەس لە ئێوە دۆستايەتيان بكات، ئەوا ئەوانەن زاڵم وستەمكار».

[پاشان هەڕەشەيەكى توند دەكات لەوەى خۆشويستى دونيـــا بخەيتـــە پـــێش خۆشـــويتى خـــوا وپەيامبـــەر

---

تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِـالْمَوَدَّةِ وَقَـدْ كَفَـرُوا بِمَـا جَاءَكُمْ مِنْ الْحَقِّ إِلَى قَوْلِهِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾.

وجیهادکردنەوە لە پێناویدا، دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا[١٣] حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾.]

هەروەها خوای گەورە دەفەرمێ: ﴿لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ الله وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ [المجادلة: ٢٢].

---

[١٣] ئەوەش بۆ هەڕەشە وتەهدیدە، وەکو پێیان بڵێ چاوەڕێی سزای توند وسەخت بکەن.

واتە: «نابینی کەسانێك بڕوایان بەخوا وڕۆژی دوایی هەبێت، لە هەمان کاتتدا کەسانێکیان خۆشبوێت کە دژایەتی خوا وپەیامبەرەکەیان کردوە، با باوکیشیان بن یان نەوەیان بن یان عەشیرەتیان بن»[١٤].

لە ڕاستیدا زۆربەی خەڵکی ئەم بنەما مەزنەیان لە بیرکردوە وفەرامۆش کردوە، تا کار گەیشتە ئەوەی گوێم

---

(١٤) تەواوی ئایەتەکە: ﴿أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ واتە: «ئەوانە ئیمان لە دڵیاندا چەسپاوە وبەرقەرار بوە وخوا بە وەحی ویارمەتی خوایی پشتگیریان دەکات ودەیانخاتە نێو بەهەشتانێکەوە کە ڕوبار بە ژێریدا دەڕوات وهەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە، خوا لەوان ڕازیە وئەوانیش لە خوا ڕازین ئا ئەوانەن حیزبی خوان بێگومان بزانن حیزبی خوایە سەرکەوتو وبراوە وسەرفرازە».

له یەکێك بو لەوانەی کە بە بانگخواز وخاوەن زانست دەژمێردرێن، لە ئێزگەیەکی عەرەبیەوە، -دەربارەی گاورەکان- دەیوت: ئەوان برامانن. ئای چەند وشەیەکی ترسناکە[١٥].

جا چۆن خوای تەعالا دۆستایەتی بێ باوەڕەکان و دوژمنانی بیروباوەڕی ئیسلامی قەدەغەکردوە، بەهەمان شێوە دۆستایەتی وخۆشویستنی ئیماندارانیشی واجبکردوە، خوای بەرز وبڵند دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمْ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَيُؤْتُونَ

---

(١٥) بەڵکو لەم ماوەیەدا لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەوە بە ڕاشکاوی یەکێکیان کە بە حسیاب دکتۆرای لە سودان بە دەستهێناوە وپلەدارێکی نێو یەکێك لەو حیزبە ئیسلامیانەیە وتویەتی: کوفر لە فەرهەنگی ئێمەدا نیە؟! بانگخوازێکی تریان وتی: گاورەکان کافر نین... ولا حول ولا قوه إلا بالله

الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ*وَمَنْ يَتَوَلَّ الله وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ[١٦] هُمُ الْغَالِبُونَ﴾ [المائدة:٥٥-٥٦].

---

(١٦) حیزبی خوا واتە: کۆمەڵی خوا، کە یەك کۆمەڵ وجەماعەتن نەك دەیان کۆمەڵ وجەماعەت. پاشان خوای مەزن باسی حیزبی الله وحیزبی شەیتانی کردوە، لەمەشدا دو جار باسی حیزب الله ویەك جار باسی حیزبی شەیتانی کردوە، لەم سێ شوێنەدا لەسەر بنچینەی «الولاء والبراء» حیزبی خۆیی وحیزبی شەیتانی جیا کردۆتەوە. کە سەرنج دەدەیت لە هەردو شوێنەکەدا حیزبی خوا لەیەك سیفەتدا هاوبەشن، ئەویش: دۆستایەتی خوا وپەیامبەرەکەیی وئیماندارانە، جا ئەوەش تەرازوی خواییە. تەنانەت کە باسی حیزبی شەیتانیش دەکات هەر لە یەك سیفەت هاوبەشن ئەویش دۆستایەتیکردنی دوژمنانی خوایە.

ئەو سێ شوێنەش: ١. ئەم ئایەتەیە کە ئێستا لە خزمەتیداین ﴿وَمَنْ يَتَوَلَّ الله وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ **حِزْبَ اللَّهِ** هُمُ الْغَالِبُونَ*يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَكُمْ هُزُوًا

=

واته: ((تەنها دۆست وپشتیوانی ئێوە هەر خوایە، هەروەها پەیامبەرەکەی وئەوانەی باوەریان هێناوە، ئەوانەی نوێژەکانیان ئەنجامدەدەن وزەکات دەدەن وکورنوش دەبەن و هەمیشە ملکەچن بۆ خوا، جا هەرکەس دۆستایەتی خوا وپەیامبەرەکەی وئیمانداران بکات، ئەوە هەر حیزبی خوا سەرفراز وسەرکەوتون)).

---

وَلَعِبًا مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاءَ وَاتَّقُوا اللهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾.

٢- ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مَا هُمْ مِنْكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ تا ئەوەی ئەفەرموێ: ﴿اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنْسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُولَئِكَ **حِزْبُ الشَّيْطَانِ** أَلَا إِنَّ **حِزْبَ الشَّيْطَانِ** هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾. ٣ -

ئایەتەکەی کۆتایی موجادیلە بو کە شێخ خوا بیپارێزێت باسی لێوە کرد.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ﴾[١٧] [الفتح:٢٩].

واتە: موحەممەد پەیامبەر ونێردراوی خوایە، ئەوانەشی کە لەگەڵیدان وئیمانیان پێهێناوە وشوێنی کەوتون، زۆر توندن بەرامبەر کافران وزۆر بەڕەحم ومیهرەبانن لەگەڵ یەکتردا.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ [الحجرات:١٠].

واتە: تەنها ئیمانداران برای ڕاستەقینەی یەکترن.

جا ئیمانداران لە دین وبیروباوەڕدا برای یەکترن، هاودین وهاوباوەڕن، با ڕەگ وڕەچەڵەك ونیشتیمانیان وسەردەمەکەیان لە یەکترەوە دور بێت، هەر برای

---

(١٧) هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾

یەکترن، خوای تەعالا دەفەرمویێت: ﴿وَالَّـذِينَ جَـاءُوا مِــنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُـونَ رَبَّنَـا اغْفِـرْ لَنَـا وَلإِخْوَانِنَـا الَّـذِينَ سَـبَقُونَا بِالإِيمَانِ وَلا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاًّ لِلَّذِينَ آمَنُـوا رَبَّنَـا إِنَّـكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ [الحشر: ١٠].

واتە: «وە ئەوانەی کە بەدوای کۆچبەران وپشتیواناندا دێن، ئەڵێن: پەروەردگارا! لە ئیمە ولەو برایانەشمان خۆش ببە کە بە ئیمانەوە پێش ئیمـە ڕۆیشـتون، وهـیچ بـوغز ورِق وکینەیەك لە ئاست ئیمانداران مەخـەرە دڵمانـەوە، پەروەردگارا بەڕاستی تۆ بەسۆز ومیهرەبانی».

جـا ئیمانـداران هـەر لـە یەکـەمین مرۆڤـەوە کـە دروسـتکراوە هـەتا کۆتاهـەمینیان بـا نیشـتمان وسەردەمیشیان لە یەکترەوە دوربێت، هەر بـرا ودۆسـتی

خۆشەویستی یەکترن[١٨]، وپاشینەکەیان شوێنی پێشینەکان دەکەون، وهەندێکیان دوعا بۆ هەندێکی تریان دەکەن، وهەندێکیان داوای لێخۆشبون بۆ هەندێکی تریان دەکەن.

جا «الولاء والبراء» «دۆستایەتی وخۆبەریکردن» کۆمەڵێ نیشانەی هەیە، ئەبنە بەڵگە بۆ بونی:

## یەکەمیان: لەنیشانەکانی دۆستایەتیکردنی بێباوەڕان

---

(١٨) شاعیریش لەم بارەوە خۆش ئەڵێ:

إذا اشتكى مسلمٌ في الهند أرّقني * وإن بكى مسلمٌ في الصين أبكاني

مصر ريحانتي ، والشام نرجستي * وفي الجزيرة تاريخي وعنواني

أرى بُخارى بلادي وهي نائيةٌ * وأستريح إلى ذكرى (كردستان)

وأينما ذكر اسم الله في بلد * عددت ذاك الحمى من صلب أوطاني

### ١. خۆشوبهاندن پێیان له جلوبەرگ وقسەكردندا:

چونكه خۆچواندن پێیانەوه له جلوبـەرگ وقسـەكردن وجگـە لەمانـەش، بەڵگـەن لـە سـەر خۆشويسـتنی چاولێكراو، ئا لەبەرئەمەیه پەیامبـەری خـوا صـلی الله علیـه وآلـه وسـلم دەفـەرموێ: «مَـنْ تَشَـبَّهَ بِقَـوْمٍ فَهُـوَ مِنْهُمْ»[١٩]، واته: هەر كەسێك خۆی بشوبهێنێت به هـەر كۆمەڵێكەوه ئەوا لەوانه، به یەكێك لەوان دەژمێردرێت.

بۆیـه حەرامـه خۆشـوبهاندن بـه بـێ باوەڕانـەوه لـه شتانێكدا كـه تایبەتـه بەخۆیانـەوه، لـه دابونـەریتیان، وپەرستشیان، سەر وسیمایان، وئاكاریـان، وەكـو: ڕیـش

---

(١٩) أخرجـه أبـو داود، كتـاب اللبـاس، بـاب في لـبس الشـهرة. وصححه العلامة المحدث الألباني رحمه الله.

تاشین وهێشتنەوەی شوارب «سمێڵ»[٢٠]، وقسەکردن بە زمانیان مەگەر بۆ پێویستی[٢١]، هەروەها خۆشوبهاندن

---

(٢٠) لە صحیحەیندا هاتوە لە ئیبن عومەرەوە کە پەیامبەر صلى الله عليه وآله وسلم فەرمویەتی: «خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ، وَفِّرُوا اللِّحَى وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ» واتە: «پێچەوانەی موشریکەکان بکەن، لە شوارب بگرن، وریش بهێڵنەوە. ولەلای موسلیم ئەڵێ: «جزُّوا الشوارب وأرخوا اللحى، خالفوا المجوس».

(٢١) ئیمامی عومەر ئەفەرموێ: «إياكم ورطانة الأعاجم» واتە: ئامان وریای الرطانة بن، «الرطانة»ش واتە: قسەکردن بە ئەعجەمی*، سەبارەت بە زەرورەتیش لەبەر ئەو حەدیسەیە کە پەیامبەر فەرمان دەکات بە زەیدی سابت فێری سیریانی ببێت کە زمانی جولەکەکان بو، بۆ ئەم باسەش بڕوانە اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم ص٤١٧، لشيخ الاسلام ابن تيمية، تحقيق د.ناصر العقل.

=

لــه شــێوازی جــل وبــەرگ، وخــواردن وخواردنــەوە..
وشتەکانی تریش.

**٢. نیشتەجێ بون لە وڵاتیان، وکۆچ نـەکردن لـە ترسی دینەکەی بۆ وڵاتی موسڵمانان.**

چونکه کۆچکردن بەم واتایە، وبۆ ئەم مەبەستە واجبە لەسەر موسڵمان، لەبەرئـەوەی مانـەوەی لـە وڵاتـی بـێ باوەڕاندا نیشانەی دۆستایەتیەتی بۆ بێ باوەڕان، هەر لەم سۆنگەیەوە خوای مەزن مانەوەی باوەڕداری لە نێـو بـێ باوەڕان حەرام کـردوە -ئەگـەر بتوانێـت کـۆچ بکـات-، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمْ الْمَلائِكَةُ

---

* لێرەدا مامۆسـتای بـەڕێزم: م.خـەلیل ئەحمـەد نوسـیویەتی: «الرطانـة» قسەکردنە بە زمانێك کە زۆربەی جەماوەر نەیزانن، نەك بە زمانەکان نابێت قسە بکەیت، چونکە زمانەکان لـە ئایەتـەکانی خودان، ودروستە بە هەر هەمویان قسە بکرێت.

ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً ، إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنْ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلا يَهْتَدُونَ سَبِيلاً ، فَأُوْلَئِكَ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوّاً غَفُورًا ﴾ [النساء:٩٧-٩٩] .

واتە: ئەوانەی فریشتەکان گیانیان دەکێشن -لەکاتی سەرەمەرگدا-، کە ستەمیان لە خۆیان دەکرد وکۆچیان نەدەکرد بۆ وڵاتی باوەڕداران، فریشتەکان پێیان ئەڵێن: ئێوە لە کوێدا ژیانتان دەبردە سەر، بۆچی لە موشریکەکان جیا نەبونەوە، بەڵکو ژمارەی ئەوانتان زیادکرد، ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێ دەسەڵات بوین لە سەر زەویدا وتوانای کۆچکردنمان نەبو، -چونکە ڕاست ناکەن-، بۆیە فریشتەکان پێیان دەڵێن: ئایا زەوی

خوا پان وفراوان نەبو، تا کۆچبکەن، ئـا ئەوانـە شـوێنی مانەوەیان دۆزەخە کە سەرەنجامێکی خراپە، تەنها ئەوانە نەبێت کە -بەڕاستی- بێ دەسـەڵاتن لـە پیـاوان وژنـان ومندالآن کە هیچ چارەیان نیە وتوانای کۆچکردنیان نیە، ئا ئەوانە ئومێد دەکرێت خـوا لێیـان خـۆش ببێـت[٢٢]، وخوا هەمیشە لێبوردە ولێ خۆشبوە.

دەبینی لەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار عـوزر لەوانەی لە وڵاتـی کـافران نیشـتەجێ دەبـن وکۆچـناکەن، قبـوڵ ناکات، تەنها عـوزر لەوانە قبوڵ دەکـات کـە لاواز وبـێ دەسـەڵاتن، توانـای کۆچـکردنیان نیـە، هـەروەها ئـەو کەسانەش عـوزریان هەیە کە لەبەر بەرژەوەندیەکی دیـنی

[٢٢] ﴿عَسَىَ اللّه﴾: ئیبن عـەبباس ئەڵێ: «عَسَى مِنَ اللهِ وَاجِبَة». بەشکو لەلایەن خواوە بەکار هات مسۆگەرە.

دەمێننەوە وەکو بانگەوازکردن بۆلای خوا وبڵاوکردنەوەی ئیسلام لە وڵاتانەدا[٢٣].

## ٣. سەفەرکردن بۆ وڵاتیان بەمەبەستی گەشت وگوزار وڕابواردن.

سەفەرکردن بۆ وڵاتی بێ باوەڕان حەرامە، مەگەر بۆ زەرورەتێك، وەك: چارەسەرکردن، وبازرگانی، وفێربونی زانست لە بوارە بەسودەکان کە ئەگەر بەسەفەرکردن نەبێت بۆ ئەو وڵاتانە ئەو زانستە بەدەست نایەت، ئەوکاتە بە پێی پێویستی دروستە، کە پێویستی تەواو بو، واجبە بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی موسڵمانان.

---

(٢٣) جا سەرنج بدە، ئەمانە موسڵمان بون وکۆچیان نەکردوە، ئەی چ جای موسڵمانێك لە نیشتمانی ئیسلامەوە کۆچ بکات بۆ نیشتمانی بێ باوەڕان وەکو لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەیبینین.

بۆ دروستێتی ئەم سەفەرەش مەرجە ئەو کەسەی کــە سەفەر دەکات، بەئاشکرا ئاسەواری دینداری پێــوە دیــار بێــت ودینــداری خــۆی بکــات وســەربەرز بێــت بــە ئیسلامەتیەکەی، ولە شوێنە خراپەکان دور بکەوێتــەوە، وئەبێت ئاگاداری خۆی بێت لــە پــیلان گێــڕی دوژمنــان وفرِوفێڵیان، بە هەمان شێوە دروستە یــا واجبــە ســەفەر بکرێت بۆ ولاتیان ئەگەر هاتو لــە پێنــاو بانگــەوازکردن وبلاَکردنەوەی ئیسلام بو[٢٤].

**٤. یارمەتیــــدانیان وسەرخســــتنیان بەســــەر موسڵمانانداا، وستایشکردنیان وهاتن بەشــان وباڵیــان وبەرگری لێکردنیان.**

---

[٢٤] بــە کــورتی ئــەبێت ئەوەنــدە زانســتی پــێ بێــت بەرگــەی شوبوهات وگومانی ئەوان بگرێت، وئەوەندەی ئیماندار ودیندار بیت بەرگەی شەهەواتی ئەوان بگرێت.

ئەمەش یەکێکە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام ولــە هۆکارەکانی هەڵگەڕانەوە لە دین-، پەنا بەخوا لەم جۆرە کردارانە(٢٥).

**٥. داوای یارمـــــەتی لێکردنیـــــان ومتمانــــــە پێکردنیان، وکردنیان بە کاربەدەست وڕاوێژکار.**

---

(٢٥) چونکە سەرخستنیان بەسـەر موسـڵمانانـدا بـە کـۆدەنگی زانایان کـوفرە، یارمـەتی دانیـان وستایشـکردنیان وهـاتن بەشـان وباڵیان وبەرگری لێکردنیان هـەمو ئەمانـەش نیشـانەی ڕازی بونـە بەوەی ئەوان لەسەرین لە کوفر وبێدینی، ئەمەش وەکـو شـێخ خـوا بیپارێزێت فەرموی: کوفرە.

قال الشيخ عبـدالعزيز بـن بـاز رحمـه الله في «مجمـوع الفتـاوى»: «وقد أجمع علماء الإسلام على: أنَّ من ظاهر الكفار علـى المسـلمين وساعدهم بأي نوع من المساعدة فهو كافر مثلهم».

خوای بەرز وبڵند دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً[٢٦] مِنْ دُونِكُمْ لا يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً وَدُّوا مَا

---

(٢٦) لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە، پەیامبەر صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: «مَا بَعَثَ اللهُ مِنْ نَبِي وَلا اسْتَخْلَفَ مِنْ خَلِيفَةٍ إلا كَانَتْ لَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْخيرِ وتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالسُّوءِ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَالْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللهُ» واتە: خوای گەورە هیچ پەیامبەرێکی نەناردوە وهیچ خەلیفەیەکی دانەناوە، مەگەر دو «بطانە»ی هەیە، «بطانە»یەك کە فەرمانی پێدەکات بە چاکە وهانی دەدات لەسەری، و«بطانە»یەك فەرمانی پێدەکات بە خراپە وهانی دەدات لەسەری، پارێزراویش ئەوەیە خوا بیپارێزێت.

بطانەی مرۆڤ یانی: صاحب سر، ئەوەی کە سڕ ونهێنی لا باسدەکات لە دارو دەست وپێوەندەکەی.

بەغەویش ئەڵێ: «بِطَانَة»ی پیاو، زۆر نزیکەکانیەتی، خوا هۆکاری قەدەغەکردنی ئەم کارەشمان بۆ ڕون دەکاتەوە ودەفەرموێ:
=

کۆڵنادەن وکەمتەرخەمی ناکەن لە کردنی هەر کارێکدا زیانی ئێوەی تێدابێت.ت.و

شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیەش ئەڵێ: «خەڵکانی ئەزموندار بۆیان دەرکەوتوە، کەوا ئەهلی زیمە لە جولەکە وگاور ومونافیقەکان، هەمیشە بە درێژایی مێژو ژێر بە ژێر نامەیان بۆ هاو دینەکانی خۆیان ناردوە، هەر هەواڵ ونهێنیەکی موسڵمانانیان پێگەیشتبێت، بۆیان باسکردون، تەنانەت کۆمەڵێك لە موسڵمانان لە وڵاتانی تەتەر گیران، وهاوشێوەکانی ئەمەش کە زۆرە، هەر بە هۆی باسکردنی ئەهلی زیمەوە بو بۆ هاودینەکانی خۆیان. لەو شیعرە بەناوبانگانەشی کە گوتراوە:

کل العداوات قد ترجی مودتها * إلا عداوة من عداك في الدين

هەمو دوژمنایەتیەك دەکرێ خۆشەویستی بە دوادا بێت

دوژمنایەتی دینی نەبێ ئەو هیوایەی لێ ناکرێت

لەبەر ئەم هۆیانە وهۆی تریش، قەدەغەیە بکرێن بە کاربەدەستی موسڵمانان.. بەڵکو دانانی موسڵمانی لەوان کەم شارەزاتر بە سودترە بۆ موسڵمانان بۆ دین وژینیان، کەمێکی حەڵاڵ زۆر

=

بەرەکەتدارترە لە زۆرێکی حەرام، ئەمەیان خوا سبحانە دەیباو پێت قوتەکەی ناهێڵێ. بڕوانە مجموع الفتاوی بە دەستکاریەوە.

**لەمانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە:**

- نابێت بێ باوەڕ بکرێتە کاربەدەست، ودەسەڵاتی بەسەر موسڵمانناندا هەبێ، یان بخرێتە شوێنێك بتوانێت لە ڕێگەیەوە پەی ببات بەنهێنی موسڵمانان، وەکو ئەوەی بکرێنە وەزیر، وڕاوێژکار، یان بکرێنە فەرمانبەر لە کار وباری دەوڵەتدا.

- دەکرێت بەکرێ بگیرێن بۆ بەجێهێنانی هەندێك کاری لاوەکی کەوا هیچ مەترسیەکیان بۆ سەر سیاسەتی دەوڵەت نەبێت، وەکو دەلیل وڕێنیشاندەری ڕێگە، یان دروست کردنی بینایە، وچاککردنی ڕێگە، بەمەرجێك لەنێو موسڵمانان کەسێکی وادەست نەکەوێت هەستێت بەم کارە. وپەیامبەر ﷺ وئەبوبکر لەکاتی کۆچکرنیان بۆ مەدینە هەستان بە بەکرێگرتنی پیاوێك لەبەنی «الدیل» کە موشریك بو.

سەبارەت بە پشت بەستن پێیان لەکاتی شەڕدا:

=

لێرەدا زانایان جیاوازیان هەیـە، وڕاستەکەشـی ئەوەیـە لـەکاتی زەرورەت وپێویستیدا ئەکرێت ودروستە، بەمەرجێ ئەوەی پشتی پێ دەبەسترێت جێی متمانە بێت.

ئیبن قەییم لەسودەکانی صوڵحی حودەیبیە دەڵێ: ولەو سودانەی تێیدایە ئەوەیە: پشت بەستن بە موشریکی متمانە پێکراو لـەجیهاد دا لە کاتی پێویستیدا دروستە.. خودی ئەمەش بەرژەوەندی تێدایـە چونکە ئەو نزیکترە لەدوژمنەوە وهەواڵەکانیان وەردەگرێت.ت.و

هەروەها لەزوهریەوە هاتوە وتویـەتی: «أَنَّـه ﷺ اسْـتَعَانَ بِنَـاسٍ مِـنْ الْيَهُـودِ»، واتـە: پەیامبـەر ﷺ لەشـەری خەیبـەردا لەسـاڵی حەوتدا پشتی بەهەندێك جولەکە بەستوە. هەروەها ئەڵێن: صەفوان لەشەڕی حونەیندا بەشداری کردوە ولەگەڵ ئەوەشدا موشـریك بـوە. هەربۆیە بۆ پێویستی دروستە، وەکو ئەوەی بـێ بـاوەڕان ژمارەیـان زیاتر بێت ومەترسیان لێ بکرێت، بەو مەرجـەی گومـانی چـاکیان بەموسڵمانان هـەبێت ڕق لـە دڵ نـەبن بەامبـەریان، بـەڵام ئەگـەر پێویست نەبو، ئەوا نابێت.

أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الآيَاتِ إِنْ كُنْـتُمْ تَعْقِلُونَ*هَـا أَنْتُمْ أُوْلاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ وَإِذَا لَقُـوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَـيْكُمْ الآنَامِـلَ مِـنْ الغَـيْظِ قُـلْ مُوتُـوا بِغَـيْظِكُمْ إِنَّ اللهَ عَلِـيمٌ بِـذَاتِ الصُّـدُورِ*إِنْ تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُـؤْهُمْ وَإِنْ تُصِـبْكُمْ سَـيِّئَةٌ يَفْرَحُـوا بِهَـا وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُـوا لا يَضُـرُّكُمْ كَيْـدُهُمْ شَـيْئاً إِنَّ اللهَ بِمَـا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ*[وَإِنْ تَصْـبِرُوا وَتَتَّقُـوا لاَ يَضُـرُّكُمْ كَيْـدُهُمْ شَيْئًا إِنَّ اللهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ] ﴾ [آل عمران:١١٨-١٢٠].

واته: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، نهـێنی خۆتـان وكاروبـاری موسـڵمانان لای كەسـانی جگـە لـە خۆتـان مەدركێنن، مەیانكەن بـە كاربەدەسـت، چـونكە ئـەوان كەمتەرخەمی ناكەن لە دروسـتكردنی ناخۆشـی وئـازار ونارەحەتی بۆ ئێوە، دەخـوازن كـە ئێـوە دوچـاری ئـازار ودەردەسەری ببنەوە، زۆر بـە ئاشـكرا ڕق وكینـە بـەدەم

وقســـەیانەوە دیـــارە، وئەوەشـــی لـــە دڵ وســـینەیان شاردراوەتەوە گـەورەترە لـەوەی دەری دەخـەن، وا ئێمـە بەجوانی نیشانەکانمان بـۆ دیـاری کـردون، ئێـوەش خێـر وشـەڕی خۆتـانی پـێ بـزانن ودۆسـت ودوژمنتـانی پـێ جیابکەنەوە ئەگەر ئێوە ژیـرن* ئـەوەتا ئێـوە ئـەوانتان خۆشدەوێت، بەڵام ئەوان ئێوەیـان خۆشـناوێت وباوەڕتـان بەهەمو کتێبە ئاسمانیەکان هەیە، بەڵام ئەوان باوەڕیان بە کتێبەکەی ئێوە نیە، کاتێکیش کە پێتان دەگەن دەڵـێن: ئێمە ئیمانمان هێناوە، بەڵام هەرکـە تـەنها کـەوتن سـەر پەنجەکانیان دەگەزن لە ڕق وداخ لەدڵیانـدا، پێیـان بڵـێ: دەك بە داخ وڕقتانەوە بـمرن، بەڕاستی خوای پەروەردگار زانایە بەوەی کە لە دڵەکان حەشـاردراوە * ئەگـەر خێـر وخۆشیەکتان توش ببێت -وەکو سەرکەوتن بەسەردوژمن ودەست کـەوتنی غەنیمـەت وفـتح کردنـی ناوچـەکان-،

ئەوان پێی غەمبار دەبن وپێیان ناخۆشە خۆ ئەگەر بەڵا وناخۆشیەکتان بێتە پێش، پێی دڵخۆش دەبن وکەیفی پێ دەکەن*[جا ئەی ئیمانداران ئەگەر ئێوە خۆگربن و پارێزکاربن، ئەوا پیلان گێڕی وتەڵەکە وفڕوفێڵی ئەوانە هیچ زیانتان پێ ناگەیەنێ، چونکە بەڕاستی خوا دەوری کار وکردەوە ونەخشە وپیلانی ئەو کافرانەی داوە].

جا ئەم ئایەتە پیرۆزانە نێو دڵی کافرانمان بۆ شیکار دەکەن وڕونی دەکەنەوە، کە چی لە دڵیاندا هەیە بەرامبەر موسڵمانان:

- لە ڕق وکینە.
- لە پیلانگێڕی ژێر بە ژێری دژ بە موسڵمانان.
- لە فڕوفێڵ وخیانەت.
- لە پێخۆشبونیان بە زیانلێکەوتنی موسڵمانان.

- لــه زەرەرگەیانــدن بــە موســڵمانان بــە هــەمو هۆكارێك.

- وئەوەی: ئــەوان متمانــە بــونی موســڵمانان پێیــان دەقۆزنـــەوە بـــۆ پـــیلان گێـــڕی وزیـــان پێگەیانـــدنیان ولەناوبردنیان.

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەت دەكـات لـە ئـەبو موسـای ئەشعەریەوە ڕەزای خوای لێبێت، ئەڵێ: «قُلْتُ لِعُمَرَ: لِـي كَاتِبٌ نَصْرانيٌ، قَال: مالَكَ قاتَلَكَ اللهُ، أَمَا سَـمِعتَ قولَـه تَعَالى: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَـاءَ بَعْضُـهُمْ أَوْلِيَـاءُ بَعْـض﴾ [المائــدة: ٥١]، ألا اتخـذتَ حنيفاً؟! قلتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ لِي كِتَابَتُه وَلَه دِينُه، قَـاَلَ:

لاَ أُكْرِمُهم إِذْ أَهَانَهم اللهُ، ولاَ أُعِـزُّهم إِذْ أَذَلَّهـم اللهُ، ولاَ أُدنيهم وقد أقصاهم اللهُ))[٢٧].

---

[٢٧] بەیهەقی بـە چـەند لـەفزێك دەیگێڕێتـەوە ئـەڵێ: ((أَنّ أَبَـا مُوسَى رَضِي اللهُ عَنْه وُفِدَ إِلى عُمَـر بـن الخَطَّـابِ رَضِـيَ اللهُ عَنْهُمـا وَمَعه كَاتِب نَصْرانِي، فَأَعْجَب عُمَر رضي الله عنه مَا رَأَى مِنْ حِفْظِه فَقَال: قُل لِكَاتِبِك يَقْرأُ لَنَا كِتَابًا، قَاَلَ: إِنَّهُ نَصْرَاني لاَ يَدْخُل المَسْجِد، فَانْتَهَره عُمَر رضى الله عنه، وَهَمَّ بِه، وانْتَهَرَني وَضَرَب فَخْذِي وَقَـال: أَخْرِجْه، وقَرَأ ((يا أيهـا الـذين آمنـوا لا تتخـذوا اليهـود والنصـارى أولياء)) الآية، قال أبو موسى: وَاللهِ مَا تَوَلّيتـه، إِنَّمَـا كَـان يَكْتُـب، قَال: أَمَّا وَجَدْتَ فِي أَهْلِ الإِسْلام مَنْ يَكْتُـب لَـك؟! لاَ تُكْرِمُـوهم إِذْ أَهَـانَهُم الله ولاَ تَـدْنُوهُم، إِذْ أَقْصَـاهُم اللهُ، ولاَ تَـأْتَمِنُوهم إِذْ خَـوَّنَهُم الله، ولاَ تعزوهم وَقَـدْ أَذَلَّهُـم الله. فَأَخْرجَـه أَبُـو مُوسَـى)). وصـححه الألباني في الإرواء.

((ئەبو موسای ئەشعەری لەگەڵ نوسەرە گاورەکەیدا هات بـۆلای عومـەری کـوڕی خـەتاب، ئـەوەبو عومـەر سـەیری لـە لێهـاتوی =

ئەڵێ: بە عومەرم وت: من نوسەرێكی گاورم هەیە، ئەویش وتی: ئەوە چیتە خوابتكوژێ، ئەی ئەو فەرمودەیەی خوای مەزنت نەبیستوە، كە دەفەرموێ: ﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەكە وگاورەكان

---

نوسەرەكەی هات، وتی: بە نوسەرەكەت بڵێ: كتێبێكمان بۆ بخوێنێتەوە مادام ئاوا لەبەركردنی باشە، وتی: نایەتە مزگەوت ئەو گاورە، ئەوەبو عومەر چو بە گژیدا ویستی بیكوژێت وداى بەسەر ڕانمدا، وتی: دەری بكە، ئایەتەكەی سەرەتای سورەتی الممتحنەی خوێند، ئەبو موسا وتی: والله بەرپرسیارێتیم پێنەداوە، تەنها دەنوسێت، وتی: لەنێو موسڵماندا كەسێكت نەبینیوە بۆت بنوسێت، ڕێزیان لێمەگرن لە كاتێكدا خوا بێڕێزی كردون، نزیكیان مەكەنەوە لە كاتێكدا خوا دوری خستونەتەوە، مەیانكەن بە ئەمین ودەستپاك لەكاتێكدا خوا بە خائین ودەست پیس باسی كردون، وبەهێزیان مەكەن لەكاتێكدا خوا بێهێزی كردون، ئەوەبو ئەبو موسا دەریكرد»
من لێرەدا چەند ڕیوایەتێكم تێكەڵ كردوە لەبەر سود گەیاندن.

مەکەن بە دۆستی خۆتان، ئەوان هەندێکیان دۆستی هەندێکی تریانن﴾ ئەی بۆ یەکتا پەرستێك دانانێیت؟ منیش وتم: ئەی ئەمیری ئیمانداران نوسینەکەی بۆ من، ودینی خۆی بۆ خۆی، ئەویش وتی: نەخێر ڕێزیان لێ ناگرم لەکاتێدا خوا بێ ڕێزی کردون، وبەهێزیان ناکەم لەکاتێکدا خوا زەلیلی کردون، ونزیکیان ناخەمەوە لەکاتێدا خوا دوری خستونەتەوە.

ئیمام ئەحمەد[٢٨] وموسلیم دەگێڕنەوە: کە پەیامبەر ﷺ دەرچوە بەرەو بەدر، پیاوێکی موشریك شوێنی

---

[٢٨] کە ئیمامی ئەحمەد دەبینی ناوی لەگەڵ بوخاری وموسلیمدا دێت ودەخرێتە پێشەوە، مالیکیش بە هەمان شێوە، یەکەم لەبەر لە پێشێتی ئەو ئیمامانەیە لە ڕوی وزانست وتەمەن وجیلەوە، هەروەها لەبەر پلە وپایەیان لە نێو ئومەتدا کە خاوەن مەزهەبێکن، لەبەر ئەمانە وجگە لەمانەش پێشدەخرێن، بوخاری وموسلیمیش کە =

کەوتوە ولە ناوچەی «الحرە» پێی گەیشتوە، [ئەڵێ هاوەڵان دڵیان زۆر خۆش بو، چونکە پیاوێکی ئازا ولێهاتو بو]، وتی: ئەمەوێ شوێنت بکەوم وشتێکم دەست بکەوێ لەگەڵتاندا، ئەویش فەرموی: باوەڕت بەخوا وپەیامبەرەکەی هەیە؟ وتی: نەخێر، فەرموی: بگەڕێوە، پشت بە موشریك نابەستم»[٢٩].

---

دەخرێنە پێشەوە زۆرجار لەبەر صەحیحی کتێبەکانیانە کە هەمو ئومەت بە کۆدەنگی لەسەریان کۆکە، وەکو موسنەدی ئیمام ئەحمەد وموەتتەئی مالك نیە کە حەدیسی لاوازیشیان تێدایە. واللە أعلم

[٢٩] ولفظ مُسْلِم: عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: «خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قِبَلَ بَدْرٍ، فَلَمَّا كَانَ بِحَرَّةِ الْوَبَرَةِ أَدْرَكَهُ رَجُلٌ قَدْ كَانَ يُذْكَرُ مِنْهُ جُرْأَةٌ وَنَجْدَةٌ، فَفَرِحَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ رَأَوْهُ فَلَمَّا أَدْرَكَهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: جِئْتُ لِأَتَّبِعَكَ وَأُصِيبَ مَعَكَ. قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ؟ قَالَ: لا، قَالَ: فَارْجِعْ فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ. قَالَتْ: ثُمَّ مَضَى حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالشَّجَرَةِ، أَدْرَكَهُ =

جا لەم دەقانەوە بۆمـان دەردەكـەوێت: حەڕامـە بـێ باوەڕان بكرێن بە كاربەدەست بەسەر موسڵمانانەوە، كـە بەهۆيەوە بتوانن ئاگايان لـە حـاڵی موسـڵمانان هـەبێت ونهێنيەكانيان بـزانن، وپـيلان وفێڵيـان بـۆ دابڕێـژن بـۆ ئەوەی زيانيان پێ بگەيەنن.

لە نمونەی ئەمەی كە باسمكرد، هاتنی بێ باوەڕانە بـۆ وڵاتانی موسڵمانان، بەتايبەت -بۆ وڵاتی هەردو حەرەمە بەڕێزەكـــە-[٣٠]، كـــە كـــراون بەكارەكـــەر وشـــۆفێر

---

الرَّجُلُ فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ، فَقَـالَ لَـهُ النَّبِـيُّ ﷺ كَمَـا قَـالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ، قَالَ: فَارْجِعْ فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ. قَالَ: ثُمَّ رَجَعَ فَأَدْرَكَهُ بِالْبَيْدَاءِ. فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ: تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَرَسُـولِهِ؟ قَـالَ: نَعَـمْ. فَقَـالَ لَـهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَانْطَلِقْ)).

[٣٠] دو حەرەمە بەڕێزە پيرۆزەكە، يانی مەككە ومەدينە، پێيان دەوتـــرێ حـــەرەم چـــونكە ئيـــبراهيم مەككـــەی حـــەرام كـــردوە =

وخزمــەتكار، وكــراون بــە پەروەردەكــەر لەماڵەكانــدا، وتێكەڵ بون لەگەڵ خێزانەكاندا، بەڵكو تێكەڵ بون لەگەڵ سەرجەم موسڵمانان لە سەرتاپای وڵاتانی ئیسلامدا.

**٦. ڕۆژ ژماردن بــە ڕۆژمێــری ئــەوان، بەتایبــەت ئەگەر گوزارشت بێت لە داب ونەریت وجــەژنیان، وەك ڕۆژمێری زایینی.**

مێژوی زاینــیش بریتیــە لــە یــادی لــە دایــك بــونی عیسای مەسیح -ســەلامی خــوای لەســەر بێــت-، ئــەو یادەی كە لەلایەن خۆیانــەوە دایــان هێنــاوە ولــە دیــنی مەسیحدا -سەلامی خوای لەسەر بێــت- شــتی وا نیــە،

---

وپەیامبەریش مەدینەی حــەرام كــردوە. ئەمــەش لــە حەدیســێكدا هــاتوە، كــە ئیمــام ئەحمــەد وئــەبو داود ونەســائی بــە صــحیحی ڕیوایەتیان كردوە وئەصڵەكەشی لە صەحیحەیندایە: «إبـراهيم حـرم مكة، وإني أحرم المدينة، حرام ما بين حرتيها..».

بۆیـــه بـــەکارهێنانی ئـــەم مێـــژوه وکردنـــی بـــه ڕۆژمێـــر، بەشداری کردنێکه بـــۆ زیندوکردنـــەوەی دروشـــم وجـــەژنی ئەوان.

وهەر لەبەر خۆ دورخستنەوه بو لەمه، هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت کاتێك ویستیان مێژویەك بـــۆ موســـڵمانان دابنێن لەسەردەمی خەلیفه عومەر دا، -ئـــەوەبو وازیـــان لـــه ســـەرجەم مێـــژوەکانی تـــری بـــێ بـــاوەڕان هێنـــا ولـــه کۆچـــکردنی پەیامبـــەرەوه مێـــژویان دانـــا-، ئەمـــەش بەڵگەیه لەسەر واجبێتی پێچەوانەکردنی بێ باوەڕان لـــەم پرسه وله پرسەکانی تریشدا که له تایبەتمەنـــدی ئەوانـــه. هەر خوایش پشت وپەنایه.

**٧. بەشـــداری کردنیـــان لـــه جەژنەکانیانـــدا، یـــا یارمـــەتی دانیـــان لەســـازکردنیدا، یـــا پیرۆزبـــایی لێکردنیان بەو بۆنەیەوه، یا ئامادەبون تیایدا.**

خوا سبحانه دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ﴾ [الفرقان: ٧٢].[٣١]

ئەم ئایەتەش تەفسیر کراوە بەوەی: ئامادەی جەژنی کافران نابن. کە ئەمەش یەکێکە لە سیفاتی بەندەکانی خوا.

**٨. پیاهەڵدانیان ودڵخۆشی کردن بەو مەدەنیەت وشارستانیەتەی ئەوان لەسەرین، وسەرسام بون بەڕەوشتیان ولێهاتوییان، بەبێ تەماشاکردنی بیروباوەڕە پوچ ودینە خراپەکەیان.**

خوای تەعالا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾ [طه:١٣١].

---

[٣١] واتە: ئەوانەی بەشداری ئاهەنگی بێ باوەڕان ناکەن.

واتە: «چاو مەبڕە بە ماڵی دونیای خۆشگوزەرانەکان، بە ماڵ وکۆشك وتەلار وخواردن وخواردنەوەی خۆش وجل وبـــەرگی گرانبـــەهاکانیان، ئەوانـــەی ئاخیرەتیـــان لـــە بیرکردوە، ئەمەیان بۆیە پێدەدەین تا تاقیـان بکەینـەوە، بـەڵام بێگومـــان ڕزق وبەخششـــی پـــەروەردگارت باشـــتر وهەمیشەییترە»[٣٢].

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە موسـڵمانان هۆکارەکـانی بـە هێزبـون ناگرنەبـەر، لـە فێربـونی پیشەسـازیەکان وبنەماکانی ئابوری ڕێپێـدراو، وشـێوازە سـەربازیەکان، بـەڵکو ئەمانـە خـوازراون، خـوای تـەعالا دەفـەرموێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ﴾ [الانفال:٦٠]. واتـە:

---

[٣٢] ئەم ئایەتە فێرمان دەکـات: هـەرکات نەفسـمان جـوڵا بـۆ جوانی ومـاڵی دونیـا، بـیری ئـاخیرەت ونـاز ونیعمـەتی نـەبڕاوەی پەروەردگار بکەینەوە، کە بۆ بەندەکانی ئامادەکردوە.

هەرچی لە تواناتاندا هەیە لە هێز وتوانا، بەگـەڕی بخـەن بەرانبەریان[٣٣].

لـە ڕاسـتیدا خـۆی ئـەم شـتە بـە سـود ونهێنیـە گەردونیانـە لـە بنەڕەتـدا بـۆ موسـڵمانانە، وەك خـوای تەعالا دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَـةَ اللَّـهِ الَّتِـي أَخْـرَجَ

---

[٣٣] لـە صـەحیحی موسـلیمدا هـاتوە: لـە عوقبـەی کـوڕی عـامرەوە، ئەڵێ: گوێم لە پەیامبەری خوا بو صلى الله عليـه وسـلم لەسەر مینبەرەوە دەیفەرمو: «﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُـوَّةٍ﴾ أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْـيُ». واتە: «ئەو ئایەتەی خوێند: ﴿هەرچی لە تواناتاندا هەیە لە هێز، بەگەڕی بخەن بەرانبەریان﴾ فەرموی: بزانن بەڕاستی هێـز هاویشـتنە، بـزانن بەڕاستی هێز هاویشتنە، بزانن بەڕاستی هێز هاویشـتنە». نـەوەوی ئەڵێ: کەواتە سونەتە موسڵمان خـۆی فێـری هاویشـتن بکـات بـە نیەتی تێکۆشان لە پێناوی خوادا..

لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِـنْ الـرِّزْقِ قُـلْ هِـيَ لِلَّـذِينَ آمَنُـوا فِـي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ [الأعراف: ٣٢].

واتە: ئەی پەیامبەر ﷺ بڵێ: ئەوە کێیە جوانیەکانی خوای حەرامکردوە کە بۆ بەندەکانی دەریهێناوە؟! کێیـە ڕزق وڕۆزیە پاکە خواییەکانی حەرام کـردوە کـە لـە بـۆ بەندەکانی دەریهێناوە؟! لە جۆرەکانی جـل وبـەرگ، لـە جۆرەکـانی خـواردن وخواردنـەوە، لەلایـەن خـواوە بـۆ بەنـدەکانی حـەڵاڵ کـراوە بـۆ ئەوەیـە لـە پەرسـتتش وگوێڕایەڵی بەکاری بهێنن، وئەمەش تایبەتـە بـە بەنـدە ئیماندارەکانەوە، هەربۆیە دەفەرموێ: بڵـێ: هـەمو ئـەو شتانە بۆ کەسانێکە ئیمانیان بەخوا وبـە پەیامبەرەکـەی هەبێت لە ژیانی دونیادا، بە خاڵصی بۆ ئەوانە لـە ڕۆژی دواییدا.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِـي السَّـمَوَاتِ وَمَا فِي الآرْضِ جَمِيعاً مِنْـهُ﴾ [الجاثية: ١٣]. واتە: هەرچی لە نێـو ئاسمانـەکان وزەویدایـە بـۆ ئێـوەی بەگـەڕ خسـتوە وموسەخەری کردوە، هەموشی بەخششن لەوەوە.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿هُـوَ الَّـذِي خَلَـقَ لَكُـمْ مَـا فِـي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾ [البقرة:٢٩]. واتە: ئەو خوایەیە کە هەرچـی لە زەویدایە بۆ ئێوە دروستی کردوە.

بۆیـە پێویسـتە موسـڵمانان پێشـبڕکێ کـار بـن بـۆ قواستنەوەی ئەو سود و ووزانە، وداوا لە کـافران نەکـەن بۆیـانی بدۆزنـەوە، بـەڵکو ئـەبێت ئـەمانیش کارگــە وتەکنەلۆژیای خۆیان هەبێت.

## ٩. ناونان بەناوەکانی ئەوان.

بە شێوەیەك کە هەندێك لـە موسـڵمانان نـاوی کـوڕ وکچەکانیان بنێن بە ناوی بیانی، و واز لـە نـاوی بـاوك

ودایك وباپیر وداپیر وناوە ناسراوەكانی نێـو كۆمەڵگـەی خۆیان بهێنن. پەیامبەری خـواش صـلی الله علیـە وآلـە وسـلم ئەفـەرموێ:((خَیْـرُ الأَسْـمَاءِ: عَبْـدُ اللَّـهِ وَعَبْـدُ الرَّحْمَنِ))، واتە: باشترینی ناوەكان، [خۆشەویسترینی ناوەكـان لـەلای خـوا]: عەبـدوڵلا وعەبدولڕحمانە[٣٤].

هەر بەهۆی گۆڕینی ناوەكانەوە، نەوەیەك پەیدا بـوە، كۆمەڵێك ناوی وا نامۆیان هـەڵگرتوە، بـوە بـە مایـەی دابڕانی ئەم نەوەیـە لـە ناوەكـانی پێشـوتر، وپچـڕاندنی

---

(٣٤) رواه مسلم: كتـاب الآداب، بـاب النَّهْـيِ عَـنِ التَّكَنِّـى بِأَبِى الْقَاسِمِ وَبَيَانِ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الأَسْمَاءِ. من حديث عبدالله بن عمر.

ئەگەرچی ئەڵێین: موسلیم ڕیوایەتی كردوە لە فلان بـاب، بـەڵام بزانە ئیمـامی موسـلیم -بـە پێچـەوانەی بوخـاری- ئـەو بابانـەی دانەناوە بەڵكو لەلایەن زانایانەوە دانراوە، بۆیە ئاگاداربە.

ناسیاری نێوان ئەو خێزانانەش کە بەناوی تایبەتی خۆیانەوە دەناسرانەوە[٣٥].

## ١٠. داوای لێخۆشبون بۆ کردنیان ورەحمەت بۆ ناردنیان

خوای تەعالا ئەمەشی حەرام کردوە وئەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ [التوبة: ١١٣].

---

(٣٥) ناونان بەناوێکەوە بەڵگەی دۆستایەتیە بۆ ئەو ناوە، ئەمەش ڕاستیەکە وەکو روناکی خۆر دیارە، تەنانەت کاتێك کە هەندێك فیلمی دۆبلاژکراو لە ناوچەکانی هەرێمدا پەخشکرا، بینیمان خەڵکانێك ناوی منداڵەکانی خۆیان دەنا بە ناوی هەندێك لە ئەکتەری ئەو فیلمانەوە.

واتە: بۆ پەیامبەر وئیمانداران نیە، داوای لێخۆشبون بۆ موشریکەکان بکەن ئەگەر چی خزمی نزیکیشیان بێت، دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن.

چونکە کردنی ئەم کارە یانی خۆشویستنیان وبەڕاست زانینی ئەوەی کە لەسەرین(٣٦).

---

(٣٦) وەك ئەوەی شتێك لە دڵی هاوەڵاندا دروست بو بێت، یان لەوەو دوا دروست دەبێت لە دڵاندا، بۆیە پەروەردگار پاش ئەم ئایەتە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَنْ مَوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ﴾ [التوبة:١١٤]. وەك ئەوەی پێمان بڵێ: ئەگەر دەپرسن ئەی بۆ ئیبراهیم داوای لێخۆشبونی بۆ باوكی كرد، وەڵامەكەی ئەوەیە: ئەوە تەنها لە ماوەیەك بو، كە دوای بۆی دەركەوت دوژمنی خوایە، ئەوەبو تەبەڕای لێكرد.

## دووەم: لە دیاردەکانی دۆستایەتیکردنی ئیمانداران

### ١. کۆچکردن بۆ وڵاتی موسـڵمانان وجێهێشـتنی وڵاتی بێ باوەڕان.

کۆچکردنیش: بریتیە لە گواستنەوە لـە وڵاتـی بـێ باوەڕانەوە بۆ وڵاتی موسڵمانان لەپێناوی دین.

کۆچکردنیش بەم واتایە ولەم پێنـاوەدا واجبـە، هـەر دەمێنێـت هـەتا قیامـەت، تـا ئـەو کاتـەی خـۆر لـە خۆرئاواوە هەڵدێ. پەیامبـەری خـواش صـلی الله علیـه وآله وسلم «تەبەڕای کردوە لە هەر موسڵمانێك لە وڵاتـی موشریکان نیشـتەجێ بێـت»[٣٧]، هـەر بۆیـە حەرامـە

---

(٣٧) ئەمـەش لـە حەدیسـێکدا هـاتوە، ئـەبو داود وتـورمزی ڕیوایەتیان کردوە، لـە جـابری کـوڕی عەبـدوڵڵاوە، پەیامبـەر ﷺ =

لەسەر موسڵمان لە وڵاتی کافراندا بمێنێتەوە، مەگەر توانای کۆچکردنی نەبێت، یان لە مانەوەکەی بەرژەوەندیەکی دینی هەبێت، وەکو بانگەوازکردن بۆ لای خوا وبڵاوکردنەوەی ئیسلام، خوای تەعالا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمْ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ

---

دەفەرموێ: «أَنا بَرِيء من كل مُسلم يُقيم بَين ظهراني الْمُشْركين» قَالُوا يَا رَسُول الله بِمَ؟ قَالَ: «لا ترَاءَى ناراهما».

قال في النهاية في غريب الحديث: أي يلزَمُ الُمسْلم ويَجبُ عليه أن يُبَاعِد مَنْزِلَه عن مَنْزل الُمشرك ولا يَنْزل بالموضع الذي إذا أُوقِدَت فيه نارُه تلُوحُ وتظهرُ لنارِ الُمشْرِك إذا أوقَدها في منزله ولكنه ينزلُ مع المسلمين في دَارِهم..اهـ. وقال الخطابي: في معناه ثلاثة وجوه: قيل معناه: لا يستوي حكمهما. وقيل معناه: أن الله فرق بين داري الاسلام والكفر فلا يجوز لمسلم أن يساكن الكفار في بلادهم حتى إذا أوقدوا نارا كان منهم بحيث يراها. وقيل معناه: لا يتسم المسلم بسمة المشرك ولا يتشبه به في هديه وشكله.

قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً ۞إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنْ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلا يَهْتَدُونَ سَبِيلاً ۞فَأُوْلَئِكَ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوّاً غَفُوراً﴾[38] [النساء:٩٧-٩٩].

**٢. سەرخستنی موسڵمانان ویارمەتی دانیان بەماڵ ونەفس وزمان لەوەی پێویستیان پێی دەبێت لە دین وژینیان.**

خوای تەعالا دەفەرموێ: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾ [التوبة:٧١]. واتە: ئیماندارانی پیاو وئافرەت هەندێکیان دۆست ویارمەتیدەر وسەرخەری هەندێکی تریانن.

---

(٣٨) پێشتر واتامان کرد.

هــەروەها دەفــەرمیّ: ﴿وَإِنْ اسْتَنصَـرُوكُمْ فِـي الـدِّينِ فَعَلَيْكُمْ النَّصْرُ إِلاّ عَلَى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ﴾ [الأنفال: ٧٢]. واتــە: وئەگــەر هــاتو موسـڵمانان داوای یارمــەتی وكۆمەكیان لێكردن لە بۆ شەڕێكی دینی، ئەوا پێویسـتە لەسەرتان سەریان بخەن وكۆمەكیان بكەن، جگە لـە دژی ئەو خەڵكانە نەبێت كـە لـەنێوان ئێـوە وئەوانـدا پـەیمان هـەبێت، ئـەو كـات ئـەو پەیمانــە مەشـكێنن و واز لــە سەرخستنیان بهێنن(٣٩).

## ٣. ئــازار پێگەیشــتن بــەئازار پێگەیشــتنیان وخۆشحاڵ بون بەخۆشحاڵ بونیان

---

(٣٩) ئەمەش بەرزی وشكۆمەندی ئیسـلام دەردەخـات، واجبێـك زایە دەكات، فەرمانێك جێ بەجێ نابێت، قەیناكات مادام پەیمانێك هەیە، لە پێناو نەشكاندنی پەیمانێك. الله أكبر، وەكو ئەو دینەم بـۆ بێنن؟!!

پەیامبەری خوا صلى الله عليه وآله وسلم دەفەرمویٚ: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالْحُمَّى والسَّهَر»[٤٠].

واتە: نمونەی ئیمانداران لە سۆز وڕەحم وبەزەییدا بۆ یەکتر، وەکو یەك لاشە وایە، ئەگەر یەك ئەندامی ئێش وئازارێکی هەبێت، هەمو ئەندامەکانی تریش ئازاریان دەبێت، بە تا وشەونخونی.

---

[٤٠] رواه البخاري: كتاب الأدب، باب رحمة الناس والبهائم. ومسلم، كتاب البر والصلة، باب تراحم المؤمنين وتعاطفهم وتعاضدهم. من حديث النعمان بن بشير.

هـــەروەها پەیامبـــەر صـــلی الله علیـــه وآلـــه وســـلم دەفـــەرمویّ: «الْمُـؤْمِنُ لِلْمُـؤْمِنِ كَالْبُنْیَـانِ، یَشُـدُّ بَعْضُـهُ بَعْضاً -وَشَبَّكَ بَیْنَ أَصَابِعِهِ-»[٤١].

واتە: ئیماندار بۆ ئیماندار وەكو بینایـەك وایـە چـۆن خشت وبلۆكەكانی تێهەڵكێشـن وهەنـدێكیان هەنـدێكی تریان قایم وتوند وتۆڵد دەكەن، موسڵمانانیش ئاوها توند وتـۆڵن ویـەكتر بـەهێز دەكـەن. ئـیتر پەنجـەكانی كـرد بەیەكدا.

**٤. ناصیح بی بۆیان[٤٢] وحەزی چاكە بۆ كردنیان وفێڵ لیّ نەكردنیان وهەڵنەخەڵەتاندنیان.**

---

[٤١] رواه البخاري: كتـاب الأدب، بـاب تعـاون المـؤمنين بعضـهم بعضا. ومسلم، كتاب البر والصـلة، والآداب، بـاب تـراحم المـؤمنين وتعاطفهم وتعاضدهم. من حديث أبي موسى

پەیامبـــەری خـــوا صـــلی الله علیـــه وآلـــه وســـلم دەفەرموێ: ((لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ))(٤٣).

واتە: کەستان ئیمانی نیە تاوەکو ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش نەبێت(٤٤).

---

(٤٢) عەرەبیەکەی: ((النصح لهـم)): الخطـابي ئـەڵێ: ((النصـيحةُ: كلمةٌ يعبَّر بها عن جملـةِ إرادةِ الخَيْـرِ للمنصـوح لـه، وهـي في اللغـةِ: الإخلاصُ من قـولهم: نَصَـحْتُ العَسَـلَ: إذا صَـفَّيْتَهُ)). واتــە: حــەزی خێرکردن بۆیان..

(٤٣) أخرجه البخاري: كتاب المظالم، بـاب نصـر المظلـوم. ومسـلم: كتاب الإيمان.

(٤٤) واتە کامــل وتــەواو نیــە، ئەمــەش بــە گــوێرەی دەقــەکان دەگۆڕێت، یاساکەشی بەم شێوەیەیە لەبەری بکە: هەرچی دەقێکــی شەرعیت بینی نەفی شتێکی دەکرد:

=

هەروەها دەفـەرموێ[٤٥]: «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لَـا يَحْقِرُهُ، وَلَا يَخْذُلُهُ، ولايُسْلِمُهُ، بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنْ الشَّـرِّ أَنْ

---

١. ئەوە ئەصلێ وایە، مەبەست پێی نەفی «بونی» ئەو شتە بێت «نفي الوجود والأصل»، وەکو: «لا خالق للكون إلا الله».

٢. خۆ ئەگەر شتەکە هەبو ئەوا مەبەست پێی نەفی دروستی شتەکەیە «نفي الصحة» وەکو: «لا صلاة لمن لم يقرأ بأمِّ الكتاب».

٣. خۆ ئەگەر ئەمەش نەدەکرا، بەوەی ئیشەکە بەبێ ئەو شتەش هەر دروست بو، ئەوسا مەبەست پێی نەفی تەواوی شتەکەیە «نفی الكمال» وەکو ئەم دەقە. ئێستا لەم دەقەدا ئەگەر ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەی پێی خۆش نەبێت، بێ ئیمانە؟! نەخێر، ئەی ئیمانەکەی کامڵە؟! نەخێر. کەواتە ئیمانەکەی کامڵ وتەواو نیە.

[٤٥] أخرجه البخاري: كتاب المظالم، باب: لايظلم المسلمُ المسلمَ ولايسلمه. ومسلم: كتاب البر والصلة والآداب، باب: تحريم ظلم المسلم.

يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ)).

واته: ((موسڵمان برای موسڵمانه، به کەمی نازانێت، وسەر شۆڕی ناکات، وتەسلیمی ناکات ((نایدات بە دەستەوە))، ئەوەندە خراپی بەسە بۆ ئەو کەسەی کە برا موسڵمانەکەی بەکەم تەماشا بکات، هەمو موسڵمانێك لەسەر هەمو موسڵمانێك حەرامە، خوێنی، ماڵی، شەرەفی)).

هەروەها دەفەرموێ: ((لا تَبَاغَضُوا، وَلا تَدَابَرُوا، وَلا تَنَاجَشُوا، ولايَبعْ بَعضُكُمْ عَلى بَيع بعضٍ، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إخوانَاً))[٤٦].

---

[٤٦] أخرجه البخاري: كتاب الأدب، باب ياأيها الذين آمنوا اجتنبوا كثيراً من الظن. ومسلم: كتاب الصلة والآداب، باب: تحريم الظن والتجسس والتناجش ونحوها.

واته: ڕقتان لەیەکتر نەبێت، وپشت لەیەکتر مەکــەن، النجش[٤٧] مەکەن، ومامەڵە بەسەر مامەڵـەی یــەکتردا مەکەن، وببنە بەندەی خوا وبرای یەك.

## ٥. ڕێــز لێگرتنیــان وبەگــەورە ڕاگرتنیــان وقســە پێنەکردنیان وعەیبدار نەکردنیان

خوای تەعالا دەفــەرموێ: ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا لا يَسْخَرْ قَومٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْراً مِنْهُمْ وَلا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْراً مِنْهُنَّ وَلا تَلْمِـزُوا أَنفُسَـكُمْ وَلا تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الإِيمَانِ وَمَـنْ لَـمْ يَتُـبْ فَأُوْلَئِـكَ هُـمْ الظَّالِمُونَ*يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِنْ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْـمٌ وَلا تَجَسَّسُـوا

---

[٤٧] النجش: ئەوەیە لە نرخی شتومەکەکە زیــاد بکــا، خۆیشــی نایکڕێ، بەڵکو بۆ ئــەوەی براکــەی بــە زیــاتر بیکــڕێ، یــان زیــانی لێبدات.

وَلا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللهَ إِنَّ اللهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ﴾ [الحجرات:١١-١٢].

واته: «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە با هیچ کۆمەڵێك لە پیاوان گاڵتە بە هیچ کەس وکۆمەڵێکی تری پیاوان نەکات وبەسوك وکەم تەماشایان نەکات، لەوە دەچێت ئەوان باشتربن لەمان، وبا هیچ کۆمەڵێك لە ئافرەتان گاڵتە بە هیچ کۆمەڵێکی تری ئافرەتان نەکات وبەسوك تەماشای نەکات، لەوە دەچێت ئەوان چاکتربن لەمان، تانەش لە یەکتر مەدەن ویەکتر عەیبدار مەکەن، و ناو و ناتۆرەی ناشرین لەیەکتر مەنێن، کە بەڕاستی خراپترین ناو وسیفەت دوای ئیمان هێنان: فیسقە: کە بریتیە ناو وناتۆرەی ناشیرین بە یەکترەوە نان، وهەرکەس تەوبە نەکات ونەگەڕێتەوە ئەوا بەڕاستی ستەمکارە *

ئەی ئەوانەی باوەڕتـان هێنـاوە بـە دوربـن لـە زۆربـەی گومانـەکان، چـونکە هەنـدێك لـە گومانـەکان تاوانـە، سیخوڕی بەسەر یـەکترەوە مەکـەن، وغـەیبـەت وزەمـی یەکتر مەکەن، ئایا کەس لە ئێـوە پێـی خۆشـە گۆشـتی براکەی خـۆی بـەمردویی بخـوات، کـە پێتـان ناخۆشـە، کەواتە خۆپارێز بن، خوا لێبوردە وبە بەزەییە ))[٤٨].

---

[٤٨] بەڕائی کوڕی عـازب ئـەڵێ: «خَطَبَنَـا رَسُـولُ الله صَـلَّى الله عَلَيه وسَلَّم حَتَّى أَسْمَعَ الْعَوَاتِـقَ فِـي بُيُوتِهَـا، أَوْ قَـالَ فِـي خُـدُورِهَا، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلسَانِهِ وَلَمْ يَـدْخُلِ الإِيمَـانُ قَلْبَـهُ، لاَ تغْتَـابوا الْمُسْلِمِينَ، [وَلاَ تُؤْذُوا الْمسْلِمين، وَلاَ تُعَيِّرُوهُم]، وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ، فَإِنَّ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أَخِيـهِ تَتَبَّـعَ الله عَوْرَتَـهُ، وَمَـنْ تَتَبَّـعَ الله عَوْرَتَـهُ يَفْضَحْهُ فِي جَوْفِ بَيْتِهِ».

واتە: پەیامبەر وتارێکی بۆ داین ودەنگی زۆر بەرز کـردەوە بـە ڕادەیەك وایکرد کچە عازەبەکانی ماڵەوە گوێیان لە دەنگی ببێـت، وفەرموی: ئەی ئەوانەی بە دەم ئێمانتان هێناوە وئیمان نەڕۆیشتۆتە

=

**٦. ئــەبێت لــە خۆشــی وناخۆشــی وتەنگانــە وفەرحانە ودارایی ونەداریدا لەگەڵیاندا بێت.**

ئەوەش بە پێچــەوانەی مونافیقەکانــەوە کــە لــەکاتی خۆشی ودارایییدا لەگەڵ ئیمانداراننن، بــەڵام لــە تەنگانــە ونارەحەتی پشتیان تێدەکەن.

خوای تەعالا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِنْ كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِنْ اللَّهِ قَالُوا أَلَمْ نَكُنْ مَعَكُمْ وَإِنْ كَانَ

---

دڵتانەوە: غەیبەت وزەمی موسڵمانان مەکەن، وئازاری موســڵمانان مەدەن، وعەیبداریان مەکەن، وشوێنی عەیب وعەواریان مەکــەون، چونکە هەرکەس شــوێنی عــەیب وکــەموکورتی براکــەی بکــەوێت، خــوای گــەورە شــوێنی عــەورەت وکــەمورتی ئــەو دەکــەوێت، هەرکەسیش خوا شوێنی عــەیب وعــاری بکــەوێت ئــابڕوی ئــەبات ئەگەر لە بن ماڵەکەی خۆیدا بێت)).

لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوا أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُمْ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ﴾[النساء:١٤١].

واته: ئەوانەی خۆیان بۆ ئێوە مەلاس داوە، چاوەڕێ دەکەن بزانن چیتان بەسەر دێت، خێرە یا شەڕە، وبۆ هەردوکیشیان بە گوێرەی نیفاقەکەیان وەلامیان ئامادەکردوە، جا ئەگەر هاتو توشی فەتح وسەرکەوتنێك بون لەلایەن خواوە، ئەوسا لەبەر دەستکەوتی جەنگ تا موسڵمانان بەشداریان بکەن، ئەڵێن: ئەی ئێمە لەگەڵتاندا نەبوین؟ خۆ ئەگەر کافرەکان توشی **بەشێك بون لە سەرکەوتن**، -جا سەرنج بدە نەیفەرمو فەتح، چونکە کافران فەتحیان بۆ ناکرێت-، مونافیقەکان ئەڵێن: ئایا ئێمە لەسەر ئێوەمان نەدەکردەوە ویارمەتیمان نەدان، ونەمانهێشت ئیمانداران زیانتان پێ بگەیەنن هەتا پێمان کرابێت.

## ٧. سەردانی کردنیان وحەزکردن لـە مولاقاتیـان، ودانیشتن لەگەڵیاندا

لـە فـەرمودەی قودسـیدا هـاتوە: «وَجَبَـتْ مَحَبَّتِـي لِلْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ»[٤٩]. واتە: خۆشەویستنی مـن پێویسـت

---

[٤٩] أخرجه أحمد والطبراني ولفظ أحمد بتمامه: «عَنْ أَبِـي مُسْـلِمٍ الْخَوْلَانِيِّ قَالَ: أَتَيْتُ مَسْجِدَ أَهْلِ دِمَشْقَ فَإِذَا حَلْقَةٌ فِيهَـا كُهُـولٌ مِـنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَإِذَا شَابٌّ فِيهِمْ أَكْحَـلُ الْعَـيْنِ بَرَّاقُ الثَّنَايَا، كُلَّمَا اخْتَلَفُوا فِي شَيْءٍ رَدُّوهُ إِلَى الْفَتَى -فَتًـى شَـابٌّ-، قَالَ: قُلْتُ لِجَلِيسٍ لِي مَنْ هَذَا؟ قَالَ: هَذَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، قَالَ: فَجِئْتُ مِنْ الْعَشِيِّ فَلَمْ يَحْضُرُوا، قَالَ: فَغَدَوْتُ مِنْ الْغَدِ، قَالَ: فَلَـمْ يَجِيئُـوا، فَرُحْتُ، فَإِذَا أَنَا بِالشَّابِّ يُصَلِّي إِلَى سَارِيَةٍ، فَرَكَعْتُ ثُمَّ تَحَوَّلْتُ إِلَيْـهِ، قَالَ: فَسَلَّمَ فَدَنَوْتُ مِنْهُ فَقُلْتُ: إِنِّي لَأُحِبُّكَ فِي اللَّهِ! قَالَ: فَمَدَّنِي إِلَيْهِ، قَالَ: كَيْفَ قُلْتَ؟ قُلْتُ: إِنِّي لَأُحِبُّكَ فِي اللَّهِ.

قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَحْكِـي عَـنْ رَبِّـهِ يَقُولُ: «**الْمُتَحَابُّونَ فِي اللَّهِ عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُـورٍ فِـي ظِـلِّ الْعَـرْشِ**

=

ومسۆگەر بوە بۆ ئەوانــەی لــە پێنــاوی منــدا ســەردانی یەکتر دەکەن.

له فەرمودەیەکی تردا هاتوە[٥٠]: «أَنَّ رَجُـلاً زَارَ أَخـاً لَهُ فِي اللهِ، فَأَرْصَدَ اللَّهُ لَهُ عَلَـى مَدْرَجَتِـهِ مَلَكـاً، فسـأله أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: أزورُ أَخاً لِي فِي اللهِ، قَالَ: هَلْ لَـكَ عَلَيْـهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَربُّهَا، قَالَ: لاَ، غَيْرَ أَنِّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللّـهِ، قَـالَ:

---

يَوْمَ **لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ**»، قَالَ: فَخَرَجْتُ حَتَّى لَقِيتُ عُبَادَةَ بْـنَ الصَّـامِتِ فَذَكَرْتُ لَهُ حَدِيثَ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَحْكِـي عَـنْ رَبِّـهِ عَـزَّ وَجَـلَّ يَقُـولُ: «**حَقَّـتْ مَحَبَّتِـي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ، وَحَقَّـتْ مَحَبَّتِـي لِلْمُتَبَـاذِلِينَ فِـيَّ، وَحَقَّـتْ مَحَبَّتِـي لِلْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ، وَالْمُتَحَابُّونَ فِي اللَّهِ عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ فِي ظِـلِّ الْعَرْشِ، يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ**» وصححه الألباني رحمه الله في صحيح الجامع الصغير.

(٥٠) رواه مسلم: كتاب: البر والصلة، باب: فضل الحب في الله.

فَإِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكَ بِأَنَّ الله قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ)).

واتە: پیاوێك سەردانی برایەكی خۆی كرد لە پێناوی خوادا، خوای گەورە فریشتەیەكی لەسەر ڕێگاكەی دانا چاوەڕێی دەكرد، پرسیاری لێكرد: نیازی كوێت هەیە؟ ئەویش وتی: سەردانی برایەكم لەبەر خوا دەكەم، وتی: هیچ مافێكت هەیە بەسەریەوە ومەبەستی وەرگرتنەوەییت هەبێت، وتی: نەخێر، تەنها ئەوە نەبێت كە من لەبەر خوا خۆشیم ویستوە، فریشتەكەش، وتی: منیش نێردراوی خوام بۆ لای تۆ، كە پێت ڕابگەیەنم خوا خۆشی دەوێی وەك ئەوت خۆش ویستوە لەبەر خوا.

## ٨. ڕێزگرتن لە مافەكانیان

نابێت مامەڵە لەسەر مامەڵەی ئەوان بكات، ونابێت نرخ لەسەر نرخی ئەوان دابنێت، ونابێت خوازبێنی لەسەر

خوازبێنی ئەوان بکـات، ونابێـت ڕێگرێیـت لـەوەی کـە ئەوان پێشی دەکەون لە شتە حەڵاڵەکان.

پەیامبەری خوا صلى الله وآله وسلم دەفەرموێ: «ألاَ لاَ يَبِـعْ الرَّجُـلُ عَلَـى بَيْـعِ أَخِيـهِ، وَلاَ يَخْطُـبُ عَلَـى خِطبَتِهِ»[٥١]. واتە: با هیچ کەس مامەڵە نەکات بەسـەر مامەڵـەی براکەیـدا، وبـا خـوازبێنی نـەکات بەسـەر خوازبێنی براکەیدا.

---

[٥١] رواه البخاري: كتاب: البيوع، باب: لايبع على بيع أخيه. ومسلم: كتاب: النكاح، باب: تحريم الخطبة على خطبة أخيه.

له ریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: «ولا یَسُومْ على سَوْمِ أَخِيهِ»[٥٢]. واتە: «وبا نرخ لەسەر نرخی براکەی دانەنێت [ئەڵێن: واتە: پاوەنکردن][٥٣]».

---

(٥٢) أخرجه مسلم: كتاب: النكاح، باب: تحريم الجمع بين المرأة وعمتها. وقد بوب البخاري رحمه الله بابًا بعنوان: بَابٌ لَا يَبِيعُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ وَلَا يَسُومُ عَلَى سَوْمِ أَخِيهِ حَتَّى يَأْذَنَ لَهُ أَوْ يَتْرُكَ.

وصُورَة السَّوم أَنْ يَأْخُذَ شَيْئًا لِيَشْتَرِيَهُ فَيَقُولَ الْمَالِكُ: رُدَّهُ لأَبِيعَكَ خَيْرًا مِنْهُ بِثَمَنِهِ، أَوْ مِثْلَهُ بِأَرْخَصَ، أَوْ يَقُولَ لِلْمَالِكِ: اسْتَرِدَّهُ لأَشْتَرِيَهُ مِنْكَ بِأَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، وَإِنَّمَا يُمْنَعُ مِنْ ذَلِكَ بَعْدَ اسْتِقْرَارِ الثَّمَنِ وَرُكُونِ أَحَدِهِمَا إِلَى الآخَرِ، وَأَمَّا صُورَةُ الْبَيْعِ عَلَى الْبَيْعِ وَالشِّرَاءِ عَلَى الشِّرَاءِ، فَهُوَ أَنْ يَقُولَ لِمَنْ اشْتَرَى سِلْعَةً فِي زَمَنِ الْخِيَارِ: افْسَخْ لأَبِيعَكَ بِأَنْقَصَ، أَوْ يَقُولَ لِلْبَائِعِ: افْسَخْ لأَشْتَرِيَ مِنْكَ بِأَزْيَدَ. وَاخْتَلَفُوا فِي صِحَّةِ الْبَيْعِ الْمَذْكُورِ فَذَهَبَ الْجُمْهُورُ إِلَى صِحَّتِهِ مَعَ الإِثْمِ وَذَهَبَتْ الْحَنَابِلَةُ وَالْمَالِكِيَّةُ إِلَى فَسَادِهِ فِي إِحْدَى الرِّوَايَتَيْنِ عَنْهُمْ، وَبِهِ جَزَمَ ابْنُ حَزْمٍ. انظر فتح الباري.

## ٩. بەزەیی هاتنەوە بە لاوازەکانیاندا

هــەروەکو پەیامبــەر صــلى الله علیــه وآلــه وســلم فەرمویــەتی: «لَـیْسَ مِنَّـا مَـنْ لَـمْ یُـوَقِّرْ کَبِیرَنَـا، وَیَـرْحَمْ صَـغِیرَنَا»[٥٤]، واتــە: لــە ئێمــە نیــە ئــەوەی ڕێــز لــە گەورەکانمان نەگرێ وبەگەورەیان ڕانــەگرێ، وبــەزەیی بــە بچوکەکانماندا نەیەتەوە.

هــەروەها پەیامبــەر دەفــەرموێ: «هــل تُنْصَــرُونَ وتُرْزَقُونَ إلا بِضُعَفَائِکُمْ؟»[٥٥]، واتە: «بــۆ مەگــەر ســەر

---

[٥٣] قال في «منتهى الأرب»: الاستيام: «بهاوكردن» بالفارسية.

[٥٤] أخرجه الترمذي: كتاب: البر والصلة، باب: ماجاء في رحمة الصبيان.

[٥٥] أخرجه الترمذي: كتاب: الجهاد، باب: ما جاء في الاستفتاح بصعاليك المسلمين. والنسائي: كتاب: الجهاد، باب: الاستنصار =

دەکەون ورۆزی دەدرێن ئەگەر لاواز وبێ دەسەڵاتەکانتان نەبێت، واتە: بە هۆی بێ دەسەڵات ولاوازەکانتانەوە خوای گەورە بەزەیی پێتاندا دێتەوە، سەرتان دەخات ورۆزیتان دەدات».

خوای بەرزیش دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ [الكهف:٢٨].

واتە: ئەی پەیامبەر ﷺ خۆڕاگر بە، لەگەڵ ئەوانەدا کە بە بەیانیان وئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە وزیکری دەکەن ودەیانەوێت خوا لە خۆیان ڕازی بکەن،

---

بالضعيف. وأبو داود: كتاب: الجهاد، الاستنصار بِرَذْلِ الخيل والضعفة.

ڕو لەوانــــە وەرمـــەگێڕە و ڕو بکەیتـــە دونیـــا ویســـتان وئەوانەی جوانی ژیانی دونیایان دەوێت.

**١٠. دوعاکردن بۆیـان وداوای لێخۆشـبون کـردن بۆیان**

خوای تەعالا دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ [محمد:١٩]. واتە: داوای لێخۆشبون بۆ تـاوانی خۆت وتاوانی ئیماندارانی پیاو وئافرەت بکە.

هەروەها خوا سبحانە دەفەرمێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالإِيمَانِ﴾ [الحشر:١٠].

واتە: وئەوانەشی کە لە دوای هاوەڵانەوە -کۆچـبەران وپشتیوانان-ـەوە دێن، ئەڵێن: ئەی پەروەردگارا لەئێمـە خۆش ببە ولەو برایانەشمان خۆش ببە کە لەپێش ئێمـەوە بە ئیمانەوە ڕۆیشتون.

## ئاگاداریەك:

سەبارەت بەو فەرمایشتەی پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿لا يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ الله يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾[٥٦] [الممتحنة:٨].

**ئەم ئایەتە مانای ئەوەیە:** هەر بێ باوەڕێك ئازاری موسڵمانانی نەدا ولەگەڵیاندا شەڕی نەكرد ولە نیشتمانی خۆیان دەری نەكردن، ئەوا موسڵمانان لەبەرامبەری ئەوەدا پاداشتیان دەدەنەوە بە چاكە لەگەڵ كردن ودادگەربون لەگەڵیاندا لە كاروباری دونیادا، بەڵام بەدڵ

---

(٥٦) واتە: خوا ڕێگریتان ناكات كە چاك ودادگەر بن لە ئاست ئەو كافرانەی كە ئازاری موسڵمانانیان نەداوە ولەگەڵیان نەجەنگاون ولە ماڵ وزێدی خۆیان دەریان نەكردون، خوا دادگەرانی خۆش دەوێت.

خۆشیان ناوێن، چونکه خوا سبحانه دەفەرموێ: ﴿أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ﴾، واته: که چاك ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەن ودادپەروەر بن لەگەڵیاندا، نەیفەرموە: که خۆشیانتان بوێن ودۆستایەتیان لەگەڵدا بکەن[٥٧].

هاوشێوەی ئەم فەرمایشتەش، ئەو ئایەتەیە که باس له دایك وباوکی بێ باوەڕ دەکات ودەفەرموێ: ﴿وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا

---

[٥٧] له ڕاستیدا تێگەیشتن لەم جیاوازیه کێشەیەکی زۆر چارەسەر دەکات، وشوبهەیەکی زۆر دەڕەوێنێتەوە، ئەو پەیامبەرەی دەفەرموێ: ((ئێوه له سەرەتاوە سلاو له جولەکه مەکەن))، هەر ئەو پەیامبەرەیە: هاوسێی جولەکەی هەیە ومافی هاوسێیەتی دەدات وقەرزی لێکردون وستەمی لێنەکردون، ئەڵێن: عەبدوللای کوڕی زوبەیر ئاژەڵێکی سەربڕیوە یەکەم جار بەشی دراوسێ جولەکەکەی خۆی داوه.

تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ﴾ [لقمان:١٥].

واته: ئەگەر هاتو دايك وباوكت كۆششيان لەگەڵدا كردی هاوەڵ بۆ من پەيدا بكەيت بەبێ هيچ بەڵگە وزانستێك، ئەوا بەگوێيان مەكە، ولە دونيادا بە باشی هەڵسوكەوتيان لەگەڵدا بكە وشوێنی ڕێبازی ئەوانە بكەوە كە بۆ لای من گەڕاونەتەوە»(٥٨).

[لێرەشدا هەڵسوكەوت ومامەڵەی دونيايی ئەبێت چاك بێت بەڵام بە دڵ نابێت خۆشيانمان بوێن].

---

(٥٨) ئەوانەن كە ئيمانيان بەخوا وفريشتەكان وكتێبەكان وپێغەمبەران ورۆژی دوايی هێناوە، وتەسليمی خودان وگەڕاونەتەوە بۆ لای ئەو. ڕێبازيشيان بريتيە لە گەڕانەوەی دڵ ولاشە بۆ لای خوا، بڕوانە تەفسيری سەعدی.

«جارێکیشـیان دایکـی ئـەسما هـات بـۆ لای ئـەسما وداوای سیلەی رەحم گەیاندنی لێکردبو کـە نەیپچـڕێنیٚ، دایکیشی کافر بو، بۆیە ئەسما بـۆ ئـەو مەبەسـتە داوای ئیزنی لە پەیامبەر کـرد، ئـەویش بـە ئـەسمائی فـەرمو: سیلەی خزمایەتی بگەیەنە وسەردانی دایکت بکە»[٥٩].

ئەمەش لەبەرئەوەی خـوای تـەعالا دەفـەرمویٚ: ﴿لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللّه وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ [المجادلة:٢٢].

واتە: کەسانێك شـك نابـەیت بڕوایـان بـەخوا وڕۆژی دوایی هەبێت لە هەمان کاتـدا کەسـانێکیان خۆشـبویت

---

(٥٩) أخرجه البخاري: كتاب الهبة، باب الهدية للمشركين. ومسلم: كتاب الزكاة، باب فضل النفقة والصدقة على الأقربين والزوج والأولاد.

که دژایەتی خوا وپەیامبەرەکەیان کردبێت، ئەگـەر چـی باوکیان بن یان نەوەیان بن یان عەشیرەتیان بن.

جا سیلەی رەحم وپاداشت دانەوەی دونیایی شـتێکە، خۆشەویستی ودۆستایەتی شتێکی ترە.

چونکە سیلەی رەحـم گەیانـدن وجـوان ڕەفتـارکردن، هاندانی تێدایە بۆ بێ باوەڕان بۆ هاتنە نێو ئیسلام، بۆیە ئـەو دو شـتە لـە هۆکارەکـانی بانگـەوازکردنن، بـە پێچـەوانەی دۆسـتایەتی وخۆشەویسـتی، ئـەم دوانـە نیشـانەی دان پێنـان وڕازی بونـە بـەوەی بـێ بـاوەڕ لەسەریەتی، ئەمەش دەبێتە هۆی بانگەواز نـەکردنی بـۆ ئیسلام.

بەهەمان شـێوە حـەرامبونی خۆشویسـتنی کـافران، مانـای ئەوەنیـە بازرگـانی حـەڵاڵیان لەگەڵـدا نـەکرێت وشتومەك ودروستکراوە بەسودەکانیان نـەهێنریت وسـود

لەشـــارەزایی وداهێنانـــەکانیان وەرنـــەگیرێت. ئـــەوە پەیامبەری خوایە ئیبن ئورەیقتی لەیسی بەکریٚ گرت بـۆ ئەوەی ڕێگەیان پیشان بدات بۆ شـاری مەدینـە، کەچـی کافریش بو[٦٠].

---

[٦٠] أخرجه البخاري: كتاب الإجارة، باب استئجار المشركين عند الضـرورة أو إذا لم يوجـد أهـل الإسـلام. عـن عائشـة وذكـرت قصـة الهجرة من بدايتها.. إلى أن قالت:.. وَاسْتَأْجَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبُو بَكْرٍ رَجُلًا مِنْ بَنِي الدِّيلِ وَهُوَ مِنْ بَنِي عَبْدِ بْنِ عَدِيّ هَادِيًا خِرِّيتًا -وَالْخِرِّيـتُ الْمَـاهِرُ بِالْهِدَايَـةِ- قَـدْ غَمَـسَ حِلْفًـا فِـي آلِ الْعَاصِ بْنِ وَائِلٍ السَّهْمِيِّ وَهُوَ عَلَى دِينِ كُفَّـارِ قُـرَيْشٍ فَأَمِنَـاهُ فَـدَفَعَا إِلَيْهِ رَاحِلَتَيْهِمَا واعدَاهُ غَارَ ثَـوْرٍ بَعْـدَ ثَلَـاثِ لَيَـالٍ بِرَاحِلَتَيْهِمَـا صُـبْحَ ثَلَاثٍ وَانْطَلَـقَ مَعَهُمَـا عَـامِرُ بْـنُ فُهَيْـرَةَ وَالـدَّلِيلُ فَأَخَـذَ بِهِـمْ طَرِيـقَ السَّوَاحِلِ..

قەرزیشی لە هەندێك جولەکە کردوە[٦١].

موسڵمانانیش هەر لە دێر زەمانەوە کـاڵا وشـتومەك ودروست کراوەکانی ئەوانیان بەکارهێناوە، ئەمەش شـت کڕینە بە پارە وهیچ فەزڵ ومنەتێکی تێدا نیە.

ئەمـــەش نابێتـــە هـــۆی خۆشویســـتن ودۆســـتایەتی کردنیـــان، کـــە حەرامـــە، خـــوای مـــەزن خۆشویســـتن ودۆستایەتی کردنی ئیمانداران وڕق لێبون ودوژمنایـەتی کردنی کافرانی واجب کردوە.

---

[٦١] أخرجه البخاري: كتـاب: الإسـتقراض وأداء الـديون والحَجْـر والتفلـيس، بـاب: مـن اشـترى بالـدين ولـيس عنـده ثمنـه أو لـيس بحضرته. عـن عائشة «أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اشْتَرَى طَعَامًـا مِنْ يَهُودِيّ إِلَى أَجَلٍ وَرَهَنَهُ دِرْعًا مِنْ حَدِيدٍ». قال ابن المنذر: وكذلك اشترى صلى الله عليه وسلم الشعير من اليهودى إلى أجل.

خوای تەعالا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَنَصَرُوا أُولَئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْض وَالَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يُهَاجِرُوا مَا لَكُمْ مِنْ وَلَايَتِهِمْ مِنْ شَيْءٍ حَتَّى يُهَاجِرُوا وَإِنِ اسْتَنْصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلَّا عَلَى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ*وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ﴾ [الأنفال:٧٢].

واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە وکۆچیان کردوە وجیهادیان کردوە لە پێناوی خوادا بەماڵ ونەفسیان، وئەوانەشی کە لە ماڵ وحاڵی خۆیاندا جێگای کۆچبەرانیان کردەوە وپشتگیریان کردن وسەریانخستن، ئا ئەوانە بەڕاستی هەندێکیان دۆست وپشتیوانی هەندێکی تریانن، وئەوانەشی ئیمانیان هێناوە وکۆچیان نەکردوە

هیچ دۆستایەتی وسەرخستن وپشـتیوانیەکیان لەسـەرتان نیە تـا کـۆچ دەکـەن، خـۆ ئەگـەر داوای سەرخسـتنیان لێکردن لە بۆ شەڕێکی دینی، ئەوا پێویسـتە لەسـەرتان سـەریان بخـەن وکۆمـەکیان بکـەن، جگـە لـە دژی ئـەو خەڵکانە نەبێت کە لەنێوان ئێوە وئەواندا پەیمان هـەبێت، ئەو کات ئەو پەیمانە مەشکێنن و واز لـە سەرخسـتنیان بهـێن، خـوای گـەورەش بینایـە بـە کردەوەکانتان*وئەوانەشی بێ باوەڕن هەندێکیان دۆسـت وپشتیوانی هەندێکی تریان، خۆ ئەگەر ئێـوەی ئیمانـدار دۆستی یەکتر نەبن وپشتیوانی تەواوی یەکتر نەکەن، ئەوا دەبێتە هۆی ئاژاوە وفەساد وخراپەیـەکی گـەورە لەسـەر زەویدا.

حــافظ[٦٢] ئـــيبن كەســـير دەفـــەرمویٚ: مانـــای فەرمایشتی: ﴿إِلاَّ تَفْعَلُوهُ تَكُنْ فِتْنَـةٌ فِـي الْـأَرْضِ وَفَسَـادٌ

---

(٦٢) ذكر العلماء أن لأهل الحديث مراتب:

- المسنِد: وهو الذي يقتصر على سماع الأحاديث وإسماعها ، من غير معرفة بعلومها أو إتقان لها، وهو الراوية فقط.

- المحدّث: وهو من يشتغل بعلم الحديث رواية ودراية ، ويطلع على كثير من الروايات وأحوال رواتها.

- الحافظ: فإن توسع في ذلك -مما ذكرناه عن المحدث- حتى عرف شيوخه وشيوخ شيوخه، طبقة بعد طبقة، بحيث يكون ما يعرفه من كل طبقة أكثر مما يجهله، فهذا هو الحافظ. والحافظ عند كثير منهم مرادف للمحدث.

- الحاكم وهو من أحاط علمه بجميع الأحاديث المروية متناً وإسناداً، وجرحاً وتعديلاً وتاريخاً.

- وزاد بعضهم لقب أمير المؤمنين: وهو لقب لم يظفر به إلا أئمة هذا الشأن كشعبة بن الحجاج وسفيان الثوري وإسحاق بن راهويه

=

كَبِيرٌ﴾ یانی: ئەگەر خۆتان بە دور نەگرن لە موشریکەکان ورِقتان لێیان نەبێت ودۆستایەتی وپشـتیوانی بـاوەڕداران نەکـەن، ئـەوا شـەڕ وفیتنـە وخراپـە لـە نێـو خەڵکـدا بەرپادەبێت، ئەمەش بریتیە: لە پەشـێو بـونی گـوزەران وتێکەڵ بـونی شـتەکان وتێکـەڵاو بـونی بـاوەڕداران بـە بێباوەڕان، بەو هۆیەوە خراپە وفەسادێکی زۆر بـەرفراوان وپەرش وبڵاو ڕو دەدات. ت.و.

---

وأحمد بن حنبل والبخاري والدارقطني من المتقدمين، وابن حجر مـن المتأخرين.

وهناك من زاد ونقص في العدد وفي التعريف، وما ذكرناه للتصـور لا لذكر الراجح. انظر: شرح الموقظة في علم المصـطلح لعبـدالله السـعد، والباعث الحثيث لأحمد محمد شاكر، وتيسـير مصـطلح الحـديث لمحمـود الطحان.

دەڵێم: ئەمە ئەوەیە کە لەم ڕۆژگارەدا ڕویداوە، خواش پشت وپەنایە.

**سێیەم: بەشەکانی خەڵك، لەواجب بونی «الولاء والبراء» دەرهەقیان**

خەڵکی لە دۆستایەتی وڕق لێبوندا دەبنە سێ بەشەوە:

**بەشی یەکەم:** ئەوانەن کە خۆشدەویسترێن بە خۆشویستنێکی پاك وپوختانە کە هیچ ڕق ودژایەتیەکی تێدا نیە.

ئەمانەش بریتین: لە باوەڕدارە موخلیصەکان، لە پەیامبەران وڕاستگۆیان وشەهیدان وپیاوچاکان.

لە پێش هەموشیانەوە پەیامبەری خوایە صلى الله عليه وآله وسلم کە خۆشویستنی ئەبێ گەورەتر بێ لە خۆشویستنی نەفس وکوڕ وباوك وهەمو خەڵکی.

پاشـــان خۆشويســـتنی خێزانـــەکانی «دايکـــانی ئيمانـــداران»[٦٣]، وئـــال وبەيتـــە پاکـــەکانی وهاوەڵـــە بەرێزەکانی دێت، بەتايبەت خەليفە ڕاشـيديەکان وبـاقی دە مژدە پێدراوەکە[٦٤]، وکۆچبەران وپشتيوانان وئــەهلی

---

[٦٣] خــوای تــەعالا دەفــەرموێ: ﴿النَّبِـيُّ أَوْلَـى بِـالْمُؤْمِنِينَ مِـنْ أَنْفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَـاتُهُمْ﴾ واتە: خێزانەکانی پەيامبــەر دايکـانی ئيماندارانن.

[٦٤] دە مژدە پێدراوەکــە: لــە حەديســێکی صــەحيحدا هــاتوە، پەيامبەر ﷺ فەرمويەتی: «أَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعُمَـرُ فِـي الْجَنَّـةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ، وَالزُّبَيْـرُ فِـي الْجَنَّةِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّـاصٍ فِـي الْجَنَّةِ، وَسَعِيدُ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ فِي الْجَنَّةِ، وَأَبُو عُبَيْـدَةَ بْـنُ الْجَـرَّاحِ فِـي الْجَنَّـةِ». رواه أحمـد والترمـذي وأبـو داود وغيرهـم مـن حديث عبد الرحمن بن عوف وسعيد بن زيد.

بەدر وئەهلی بیعەی ڕیزوان وپاشـان خۆشویسـتنی بـاقی هاوەڵە بەڕێزەکان -ڕەزای خوا لە هەمویان بێت-.

پاشـان دوای ئەمانـە شـوێنکەوتوان «التـابعين»، وسـەردەمە فەزڵدارەکـە وپێشـینان وپێشـەوایانی ئـەم ئومەتە دێت -وەك چوار ئیمامەکە-.

خوای تەعالا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِـنْ بَعْـدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالإِيمَـانِ وَلا تَجْعَـلْ فِـي قُلُوبِنَـا غِـلاًّ لِلَّـذِينَ آمَنُـوا رَبَّنَـا إِنَّـكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ [الحشر: ١٠].

واتە: ئەوانەش کە بـەدوای کۆچـبەران وپشـتیوانانداا دێن، ئەڵێن: پەروەردگارا! لە ئیمە ولەو برایانەمان خۆش ببە کە بە ئیمانەوە پێش ئیمـە ڕۆیشـتون، وهـیچ بـوغز وڕق وکینەیەك لە ئاست ئیمانداران مەخـەرە دڵمانـەوە، پەروەردگارا بەڕاستی تۆ بەسۆز ومیهرەبانی.

بەڕاستی کەسێك ئیمان لە دڵیدا هەبێت هەرگیز ڕقی لە هاوەڵان وپێشینانی ئەم ئوممەتــە نابێتــەوە. وئەوەشــی ڕقی لێیانــە تــەنها گــومڕا ودڵ نــەخۆش ومونافیقــەکان ودوژمنانی ئیسلامە وەك: شیعە[٦٥] وخەوارج[٦٦]. داوای بێوەیی لەخوا دەکەین.

---

[٦٥] بەگوشراوی وبە پوختی: ئەوانەن کە زیــادەڕەوی دەکــەن لــە خانەوادەی پەیامبەر ﷺ، خیلافەت وئیمامەت تەنها لە خانــەوادە بەڕێزەکەی پەیامبەردا ﷺ کورتهەڵدێنن، فــەزڵی ئیمــامی عــەلی دەدەنە ســەر هــەموو هاوەڵانــدا ﷺ. لــە ڕیوایــەتی صــەحیحترین ونــاودارترین کتێبیــان کــە کافیــە: ئەبوبــەکر وعومــەر وعوسمــان وعائیشە وحەفصــە بــە کــافر دەزانــن، بــەڵکو هــەموویان کــافرن، هەروەك لە ڕیواتە صەحیحە -ناصــەحیحە-کــانی خۆیانــدا هــاتوە ئەڵێ: «هاوەڵان هەموویان هەڵگەڕاونەتەوە تەنها سیان نەبێ»، بــە حەوتیش هاتووە، هەروەها قورئان بە دەستکاری کراو دەزانــن. لــە ڕووی قــەدەرەوە دیدوبۆچــونیان وەکــو قەدەریــەکان وان.. پێیــان =

دەگوترێت شیعە «لایەنگر-پشتگیر-سەرخەر» بەهۆی لایەنگریان بۆ ئال وبەیت، پێشیان دەوترێت «رافضة-ڕەفزکەر» چونکە ڕەفزی زەیدی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیبیان کرد، کاتێك پێیان وت: چی ئەڵێی لە بارەی ئەبوبەکر وعومەرەوە؟ ئەویش ستایشی کردن ووتی: ئەوە دو وەزیرەکەی باپیری منن یانی پەیامبەر ﷺ، ئەوەبوو پشتیان تێکردو وڕەفزیان کرد، بۆیە ناونران ڕافیزە. هەندێك ئەڵێن: رەفزکەر تەنها بەوانەیان ئەوترێ، کە بە ئاشکرا هاوەڵان بە کافر دەزانن وجنێویان پێ دەدەن، ئەمەش ڕای پەسەندە. بڕوانە کتێبی دەمێك لە مێژوی ئیسلام پەراوێزی ژ «١» ل٣٣٦.

(٦٦) ئەوانەن کە خروجیان کرد لە ئیمامی عەلی رضي الله عنه، هەرکەس تاوانێکی گەورە بکات بە کافری دەزانن و ئەڵێن: بە هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، هەروەها دەسەڵاتداری فاسق بە کافر دەزانن بۆیە خروج لێکردنی بە حەڵاڵ دەزانن، هەروەها ئەمانیش ئیمامی عەلی وموعاویە وعەمر وئەبو موسایان بە کافر دەزانن، حروریەیشیان پێ دەگوترێت -شوێنێکە نزیك کوفە- چونکە کاتێك

=

**بەشی دوەم:** ئەوانــەن کــە دەبوغزێنــدرێن ودژایــەتی دەکــرێن بــە پــاك وپــوختی، کــە هــیچ خۆشەویســتن ودۆستایەتیەکی تیّدا نەبیّت.

ئەمانەش کافرە پەتیەکانن: لە بیّ باوەڕان وهاوبــەش پەیداکەران ومونافیقان وهەڵگــەڕاوان وبــێ دینــەکان بــە سەرجەم ڕەگەزەکانیانەوە.

وەك خوای تەعالا دەفەرمویّ: ﴿لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللهَ وَرَسُولَهُ وَلَـوْ كَـانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ [المجادلــة:٢٢]. [پیّشتر واتامان کرد].

---

خروجیان کرد لە ئیمامی عەلی رضي الله عنه دەرچــوون بــۆ ئــەو جیّگایــە. بڕوانە کتیّبی دەمیّك لە میّژوی ئیسلام پەڕاویّزی ژ «٢» ل٣٣٦.

هــەروەها دەبــینی خــوای تــەعالا عەیبــداری بــەنی ئیسرائیل دەکات ودەفەرموێ: ﴿تَرَى كَثِيراً مِنْهُمْ يَتَوَلَّـوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَنْ سَـخِطَ اللَّـهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ، وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُـونَ بِاللَّـهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَـا اتَّخَـذُوهُمْ أَوْلِيَـاءَ وَلَكِـنَّ كَـثِيراً مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ [المائدة:٨٠-٨١].

واتە: دەبینی زۆربەیان دۆست وپشتیوانی بێباوەڕانن، سوێند بێ کارێکی خراپیان ئەنجامدا کە خوایان لەخۆیان توڕە کرد ولە سزای دۆزەخیشدا دەمێننەوە، خــۆ ئەگــەر ئەوانە باوەڕیان بهێنایە بە خوا وپەیامبەرەکــەی وبــەوەی بۆی دابەزیوە، ئەوکاتــە ئــەو کافرانــەیان نــە دەکــرد بــە دۆست وپشتیوانی خۆیان، بەڵام زۆربــەیان لــە فــەرمانی خوا دەرچون.

**بەشی سێیەم: ئەوانەن لە ڕویەکەوە خۆشدەویسترێن ولە ڕویەکەوە دەبوغزێندرێن[٦٧].**

ئەمانەش تاوانبارانی ئیمانداranن، لەم کەسانەدا خۆشەویستن وڕق لێبون کۆدەبێتەوە، خۆشدەویسترێن بەهۆی ئەو ئیمانەی هەیانە، دەبوغزێندرێن بەهۆی ئەو سەرپێچیانەی هەیانە -کە ناگەنە ئاستی کوفر وشیرك-.

خۆشویستنیشیان ئەوە دەخوازێ کە ئامۆژگاری بکرێن ونکۆڵیان لێ بکرێ، بۆیە نابێت بێدەنگ بین لە ئاست سەرپێچیەکانیان، بەڵکو جلۆگیریان لێدەکرێت وفەرمانیان پێدەکرێت بەچاکە ونەهیان لێدەکرێت لەخراپە، وحەدد وتەمبێکردنەکانیان بەسەردا

---

[٦٧] بوغز: واتە ڕق.

جێبەجێدەکرێت وتاوەکو دەست بەرداری تاوانەکانیان بــبن وبگەڕێنەوە لە خراپەکانیان.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت بە تەواوەتی ڕقمان لێیــان بێت وتەبەڕا وحاشایان لێبکــەین[٦٨]، -وەکــو خــەواریج ئەمە دەڵێن دەربارەی ئەو کەسانەی کە تاوانی گــەورەیان ئەنجام داوە ونەگەیشتۆتە ئاستی هاوەڵ پەیداکردن-.

---

[٦٨] ڕق لێبونی باوەڕداری تاوانبار، کە وەك ڕق لێبونی بێ باوەڕ نیە، بەڵکو بەشی ئیمانەکە خۆشەویستی تێدایــە، بەڵگەکــەی ئــەو حەدیسەی بوخاریە لە ئیمامی عومەرەوە دەیگێڕێتــەوە: «أَنَّ رَجُلًـا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ كَانَ اسْمُهُ عَبْدَاللَّهِ، وَكَانَ يُلَقَّـبُ حِمَـارًا، وَكَـانَ يُضْحِكُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَكَـانَ النَّبِـيُّ ﷺ قَـدْ جَلَـدَهُ فِـي الشَّـرَابِ، فَأُتِيَ بِهِ يَوْمًا فَأَمَرَ بِهِ فَجُلِدَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَـوْمِ: اللَّهُـمَّ الْعَنْـهُ مَـا أَكْثَرَ مَا يُؤْتَى بِهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لا تَلْعَنُوهُ فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ إِنَّـهُ يُحِبُّ الله وَرَسُولَهُ».

به هەمان شێوە خۆشناویسترێن ودۆستایەتی نـاکرێن بە تەواوەتی، وەکو مورجیئە ئەمە دەڵێن، بەڵکو دەبێـت ناوەند بگیرێت لەبارەیانەوە، بەو شێوەیەی باسمـان کـرد، کە بۆ چونی ئەهلی سوننەت وجەماعەتە.

جا خۆشویستن لەبـەر خـواو ڕق لێ بـون لەبـەر خـوا تونـدوتۆڵترین وپتـەوترین دەسـکی بـاوەڕە «عـری الایمان»[٦٩]، وخەڵکیش لـەڕۆژی قیامەتـدا لەگـەڵ ئـەو

---

[٦٩] ئەم وتەیەی شـێخ لـە حەدیسـێکی صـەحیحدا هـاتوە کـە تەبەڕانی لـە ئـیبن عاباسـەوە ڕیوایـەتی دەکـات، پەیامبـەر ﷺ فەرمویـەتی: «أوثـق عـری الإیمـان: المـوالاة في الله والمعـاداة في الله والحب في الله والبغض في الله عز وجل».

قال الملا علي القاري في المرقاة: وعرى الإيمان: هي في الأصـل مـا يتعلق به من طرف الدلو والكوز ونحوهما فاستعير لما يتمسـك بـه في أمر الدين يتعلق به من شعب الإيمان وقوله أوثق أي أحكم...

کەسانەن کە خۆشیان دەوێن وەکو لە فەرمودەدا هاتوە[٧٠].

بەڵام دەبینین ئەمڕۆ بارودۆخەکە گۆڕاوە وزۆربەی خەڵکی دۆستایەتی وخۆبەریکردنیان لە پێناوی دونیایە، ئەگەر کەسێك تەماعێکی دونیاییان پێی هەبێت دەبنە دۆستی، ئەگەر دوژمنی خوا وپەیامبەر ودینی موسڵمانانیش بێت.

خۆ ئەگەر تەماعێکی دونیایان پێی نەبێت، دوژمنایەتی دەکەن ئەگەر وەلی خوا وپەیامبەرەکەی

(٧٠) ئەم وتەیەی شێخ -خوا بیپارێزێت- لە حەدیسێکی صەحیحەیندا هاتوە لە ئیبن مەسعودەوە: «جاء رجلٌ إلى رسول الله ﷺ، فقال: كيف ترى في رجل أحب قوماً ولما يلحق بهم؟ فقال رسول الله ﷺ: المرء مع من أحب».

بێت، بەهۆی بچوکترین شـتەوە تـەنگی پـێ هەڵدەچـنن وسوکایەتی پێدەکەن.

عەبـدوڵای کـوڕی عـەباس دەفـەرموێ -وەك ئـیبن جەریر[٧١] ڕیوایەتی کردوە-: «مَنْ أَحَبَ فِي اللهِ، وأبغضَ في اللهِ، والى في اللهِ، وعادى في اللهِ، فإنما تُنالُ وَلايـةُ اللهِ بذلك، وقدْ صارتْ عامةُ مُؤاخاةُ الناسِ على أمرِ الدُنيا، وذلك لا يُجدي على أهلِهِ شَيئاً».

واتە: هەر کەس خۆشویسـتنی لەبـەر خـوا بـێ، وڕق لێبونی لەبەر خـوا بـێ، ودۆسـتایەتی لەبـەر خـوا بـێ، دژایەتیکردنی لەبەر خوا بێ، وەلایەتی خوا «دۆستایەتی خوا» ئا بەمانە بە دەست دێت، زۆرینـەی خـەڵك وایـان

[٧١] شێخ -خوا بیپارێزێت- وا دەڵێ، وا دیارە لە غەیرە خۆیەوە نەقڵی کردوە، بەڵام هەنـدێك لـە زانایـان ئـەڵێن لای ئـیبن جـەریر گەڕاون نەیاندۆزیوەتەوە. ئەمە جگە لەوەی ئەسەرێکی زەعیفە.

لێهاتوە برایەتیان لەسەر دونیایە کە هیچ قازانجێك بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت))

لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا فەرمویەتی، پەروەردگاری مەزن فەرمویەتی: ((مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ))[٧٢] بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

واتە: هەرکەسێك دژایەتی دۆستێکی من بکات، ئەوا شەڕی لەگەڵدا ڕادەگەیەنم.

توندترین کەسێکیش کە دژایەتی دینی خوا بکات، ئەوانەن کە دژایەتی هاوەڵە بەڕێزەکانی پەیامبەری خوا دەکەن صلى الله عليه وآله وسلم وجوێنیان پێ دەدەن ولەکەداریان دەکەن.

---

[٧٢] أخرجه البخاري: كتاب: الرقاق، باب: التواضع .

پەیامبەری خوا صلى الله عليه وآله وسلم دەفەرمویٚ: «اللّهَ اللّهَ فِـي أَصْحَابِي، [اللّهَ اللّهَ فِـي أَصْحَابِي]، لاَ تَتَّخِذُوهُمْ غَرَضاً [بَعْدِي، فَمَنْ أَحَبَّهُمْ فَبِحُبِّي أَحَبَّهُمْ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ فَبِبُغْضِي أَبْغَضَهُمْ]، فمَنْ آذَاهُمْ فَقَدْ آذَانِـي، وَمَـنْ آذَانِـي فَقَـدْ آذَى اللّه، وَمَـنْ آذَى اللّه يُوشِـكُ أَنْ يَأْخُذَهُ». أخرجه الترمذيُ وغيرُه(٧٣)

---

(٧٣) رواه الترمذي: كتاب المناقب، باب: فيمن سب أصحاب النبي. من حديث عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ. وقال: هذا حديث حسن غريب لا نعرفه إلا من هذا الوجه، وضعفه الألباني، ولكن صح الخبر عن رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم أنه قال: «احْفَظُونِي في أصْحابِي، ثُمَّ الذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَفْشُو الكَذِبُ، حَتَّى يَشْهَدَ الرَّجُلُ وما يُسْتَشْهَدُ، ويَحْلِفَ وما يُسْتَحْلَفُ». وكذلك صح عنه بل هو في الصحيحين، أنه قال: «لاتسبوا أصحابي، فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلا نَصِيفَهُ»، واتە: «جنیٚو وقسە بە هاوەڵانم مەڵیٚن، سویٚند بەوەی نەفسی منی =

واتە: ئامان ئامان خواتان لـە یـاد بێـت لـە ئاسـت هاوەڵـەکانم، مەیانکـەن بـەجێگای تانـە وتەشـەر، جـا هەرکەس ئازاریان بدات، ئازاری منـی داوە، وهەرکـەس ئـازاری مـن بـدات، ئـازاری خـوای داوە، وهەرکەسـێك ئازاری خوا بدات، نزیکە لە ناوی بدات.

تەنانەت لای هەندێك لە گروپـە گومڕاکـان دژایـەتی کردنی هاوەڵان وجنێو پێدانیان دین وعەقیدەیە[٧٤].

---

بەدەستە ئەگەر یەکێکتان بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێـڕ ببەخشـێ ناگاتە مشتێکی ئەوان بەڵکو نیـوە مشتێکیشـیان. رواه البخـاري: کتاب: فضائل الصـحابة، بـاب: لـو کنـت متخـذا خلـیلا، ومسـلم: کتاب: فضائل الصحابة، باب: تحریم سب الصحابة.

[٧٤] ئەو کۆمەڵەش شـیعەکانن خـوا لـە شـەڕ وخراپـەیان بمـان پارێزێ.

پەنا دەگرین بەخوا لە تورەیی وئێشی سـزای، وداوای لێبوردن وبێوەیی لێدەکەین .

وصلى اللهُ وسلَّمَ وباركَ علي نبيِنا **محمدٍ** وآلِهِ وصحبِه.